

# ژيانی پێشەوای ئازیزمان ﷺ

## قۆناغی شەشەم:

## چالاكييەكانی موسڵمانان و بێباوەڕان لە دوای كۆچ كردن بۆ مەدينە تاكو جەنگی خەندەق(ئەحزاب)

ئامادەكردنی:
سالارعمر



بسم الله الرحمن الرحيم

## ناسنامەی کتێب

**ناوی کتێب : ژیانی پێشەوای ئازیزمان محمد ﷺ**

**ئامادەکردنی: سالارعمر**

**نەخشەسازی ناوەوە: عبدالله خاکی**

**دیزاینی بەرگ : ڕێدارعومەر**





## شەڕفرۆشتنی قورەیش بە موسڵمانەکان لە دوای کۆچکردن بۆ مەدینە.

### _پەیوەندی کردن بە عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول:-

یەکەم هەنگاوی قورەیش بۆ دروستکردنی ئاژاوە بۆ موسڵمانان لە دوای کۆچکردن بۆ مەدینە ناردنی نامەیەکی پڕ هەڕەشە بوو بۆ سەرکردەی کۆنی مەدینە کە عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول بوو، کە پێش هاتنی پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ بۆ مەدینە زۆری نەمابوو بە تەواوی ببێتە سەرکردەی مەدینە و بە ڕۆیشتنی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو کارە هەڵوەشایەوە و سەری نەگرت، بۆیە عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی زۆر ڕقی لە پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ بوو.

لە نامەکەدا نووسیبوویان;

ئێوە ئەو هاوەڵەی ئێمەتان گرتۆتە خۆ و سوێند دەخۆین بە خوا یان ئەوە خۆتان لەگەڵی دەجەنگن و دەری دەکەن لە ناوتاندا، یان ئەوەتا ئێمە هەموومان هەڵدەکوتینە سەرتان و شەڕکەرەکانتان دەکوژین و ئافرەتەکانتان بۆ خۆمان حەڵاڵ دەکەین.

کاتێ نامەکە بە عەبدوڵڵا گەیشت لەگەڵ بت پەرستەکانی تر کۆبووەوە لە دژی پێغەمبەری خوا ﷺ.

و کاتێک پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ ئەمانەی پێ گەیشت ڕۆیشتە لایان و پێیانی فەرموو:



هەڕەشەی قورەیش بە جارێ کاریگەربووە لە ئێوەدا و نەیتوانیوە ئەوەتان لێ بکات کە ئێوە بە دەستی خۆتان لە خۆتانی دەکەن، دەتانەوێ بجەنگن لەگەڵ کوڕان و برایانی خۆتان و بیانکوژن، کە ئەمەی فەرموو ئەوان بڵاوەیان لێ کرد و دەست بەرداری ئەو کارەبوون و ئەم هەواڵەش گەیشتەوە بە قورەیش.



## _ڕاگەیاندنی ڕێگەگرتن لە سەردانی کردنی کەعبەی پیرۆز:

تەنها بەوە نەوەستان هەستان بە ڕێگەگرتن لەو کەسانەی کە لە شاری مەدینەوە بە نیازی حەج و عومرە دەڕۆیشتنە مەککە، یەکێک لەوانە ڕێگەگرتنی ئەبو جەهل بوو لە پیاوی باڵای خەزرەج "سەعدی کوڕی موعاذ" کە هاوڕێی "ئومەیەی کوڕی خەڵەف"یش بوو، کاتێ گەیشتە مەککە ڕۆیشت بۆ ماڵی ئومەیە و پێی فەرموو گەر دەوری کەعبە چۆڵ بوو هەواڵم پێ بدە بۆ ئەوەی طەواف بکەم، ئەویش پێی وت: چاوەڕێ بکە تا نزیکی نیوەڕۆ، ئەنجا خەڵکی بڵاوەی لێ دەکەن و دەڕۆن بەرەو لای ئیش و کاری خۆیانەوە ئەو کاتە طەواف بکە.

لە کاتی طەواف کردندا ئەبو جەهل بینیانی بە ئومەیەی وت ئەی ئەبو صەفوان ئەمە کێیە لەگەڵت طەواف دەکات؟

ئومەیەش وتی: ئەوە سەعدە.

سەعدیش فەرمووی: منم سەعدم.

ئەبو جەهل وتی: ئایە دەتەوێت بە ئارامی لە دەوری کەعبەدا بسوڕێیتەوە لە کاتێکدا کە هاوەڵی موحەممەدتان گرتۆتە خۆ؟ وە گوایە وتووتانە ئێوە سەری دەخەن و یارمەتی دەدەن؟

بەڵام واللّٰەی ئەگەر لەبەر ئەوە نەبێت کە لەگەڵ باوکی صەفوانیت نەمدەهێشت بە سەلامەتی بگەڕێیتەوە بۆ لای خزمانی خۆت.

سەعد بە هەڕەشەوە دەنگی بەرز کردەوە و فەرمووی:

واللهی ئەگەر ڕێگرم بیت لەم طەوافە ئەوا دەبم بە ڕێگرت لەو شتەی کە خراپتر و کاریگەرترە، ئەویش بازرگانییەکەتە بۆ شام.

جا ئومەیە زوو زوو بە سەعدی دەوت:

دەنگ بەرز مەکەوە بەسەر ئەبو حەکەمدا ئەوە گەورە و سەرۆکی ئەم دۆڵەیە، تا سەعد بێزاربوو لە ئومەیە و پێی فەرموو:

واز بهێنە واللهی گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو دەیفەرموو:

ئەوان تۆ دەکوژن، ئومەیە وتی: من؟!

سەعد فەرمووی: بەڵێ، ئومەیە وتی لە مەککە؟

سەعد فەرمووی: نازانم.

ئومەیە ترسێکی زۆری لێ نیشت و وتی:

واللهی موحەممەد هەرگیز درۆ ناکات ئەگەر ئەو قسەیەی کردبێت، ئینجا گەڕایەوە بۆ لای خێزانی و باسی ئەمەی بۆ کرد و بڕیاریدا لە مەککە دەرنەچێت.



## _نامە ناردنی قورەیش بۆ کۆچەران:

دوای ئەمانە قورەیش هەواڵیان نارد بۆ موسڵمانەکان و پێیانیان وت:

وانەزانن کە چوونە یەثرب لە دەستمان قورتارتان بووە، دێینە سەرتان ڕیشە کێشتان دەکەین و لە ماڵەکانتان وشک و تەڕتان قات و قڕ دەکەین.

هەر لە سەرتاوە کە پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ و هاوەڵانی گەیشتنە مەدینە و پشتیوانان ئەوانیان گرتە خۆ هەموو عەرەب دژی خەڵکی مەدینە بوون، بۆیە موسڵمانانیش بە شەو و ڕۆژ چەکیان پێ بوو.

و پێغەمبەری خوا ﷺ دڵنیابوو کە ئەو هەڕەشانە تەنها شتێکی ڕووت نەبوو و قورەیش شتێک دەکات بۆیە شەوان خۆی شەونخۆنی دەکرد یان هاوەڵان پاسەوانیان دەکرد.

پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ خۆی لە دەروازەی شاری مەدینە ئێشکگری دەکرد، شەوێکیان فەرمووی:

خۆزگە پیاو چاکێک ئەمشەو پاسەوانی دەکردم، دایکە عائیشە دەفەرمێت:

لەم قسانە بووین گوێمان لە دەنگی ڕاکێشانی چەک بوو، فەرمووی ئەوە کێیە؟

وتی: سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصە.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی:

بەم شەوە چی تۆی هێناوە بۆ ئێرە؟

فەرمووی: دڵم ترسی لێ نیشت بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، هاتم پاسەوانی بکەم.



پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ نزای خێری بۆ کرد و نووست.

ئەم پاسەوانێتی کردنەی پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ شەوانە بەردەوام بوو بۆ ماوەیەکی زۆر بەڵکو تا دوای جەنگی حونەین، تا خوای گەورە ئایەتی(والله یعصمك من الناس)ی دابەزاند، دوای ئەوە پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ بە هاوەڵانی فەرموو:

خەڵکینە بڵاوەی لێ بکەن و بڕۆنەوە، خوای گەورە من دەپارێزێت.



## مۆڵەتدان بۆ شەڕ کردن

لەو بارودۆخە پڕ مەترسی و هەڕەشەیەدا خوای گەورە مۆڵەتی بە موسڵمانان‌دا کە بجەنگن لە دژی بێباوەڕان و ئەم ئایەتە پیرۆزەی ناردە خوارەوە: {أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَاتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا ۚ وَإِنَّ اللَّهَ عَلَىٰ نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ}الحج_٣٩

ڕێگە درا بە جەنگ و جیهاد بۆ ئەو (موسوڵمانانەی) شەڕیان لەگەڵدا دەکرێ لەبەر ئەوەی کە بەڕاستی ستەمیان لێ کراوە و بێگومان خوا بۆ سەرخستنیان بە توانایە.

ڕاستییەکە و گومانی تێدا نییە کە ئەم مۆڵەتدانە لە مەدینە و دوای کۆچ کردنی موسڵمانان هاتۆتە خوارەوە، نەک لە مەککە.

بەڵام بە تەواوی ناتوانرێ کاتی هاتنە خوارەوەی دیاری بکرێ.

و یەکەم هەنگاو بۆ ئەم مەبەستە داخستنی ڕێگای بازرگانی نێوان مەککە و شام بوو لە لایەن پێغەمبەری ئەزیزمانەوە ﷺ، لەبەر ئەوەی قورەیشییەکان بە دەسەڵات و بەهێز بوون و ئەم ڕێگە داخستنەش لە باری دارییانی دەدا.

## چەند سریە و غەزایەکی پێش بەدر

دوای ئەوەی خـوای گەورە مـۆڵەتی شـەڕ کردنـی دا موسـڵمانەکان دەسـتیان بە جوڵەی سەربازی کرد بۆ ئەوەی بێباوەڕانی مەککە و مەدینە و دەوروبەریان بزانن کە موسـڵمانان وەکـو پێشـوو بێهێـز نـین و دەسـەڵاتیان هەیە و ئەوان وازبێـنن لە دژایەتی کردنی ئـاینی خـوای گەورە، وە بـۆ ئەوەی موسـڵمانەکان ئـازاد بـن و چیتر ئەشکەنجەی موسڵمانانی ناو مەککەی پیرۆز نەدرێ.

لەو جـوڵە سـەربازیانە گەڕان بـوو بە دوای ئەو ڕێگایـانەی کە لە دەوروبەری مەدینـەیە و بە مەکـکە دەگـات، و هەروەهـا ڕێککەوتـن لەگەڵ ئەو هـۆزانەی لەو ڕێگانە بوون.

**چەند چالاکییەک لە چالاکییەکان;**

**تێبینی//**

**مێژوونوسـان بەو جەنگانە دەڵێن(غەزا یـان غەزو) کە پێغەمـبەری ئەزیزمـان ﷺ خـۆی دەرچـوو بێـت بـۆ جەنـگەکە. جـا گەربەشـداری کردبێ یـان نـا جیـاوازی نییە.**

**و ئەو جەنگانەش کە پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی دەرنەچووە و بە سـەرکردایەتی هاوەڵێ تر بووە پێی دەڵێن (سریە).**

١. سـریەی "سـەیفلبەحر(سـیف البحـر)" لە ڕەمەزانـی سـاڵی ١ی کـۆچی بـوو، لە ئەم سـریەیەدا ٣٠ کەس لە کـۆچەران بە سـەرکردایەتی حەمـزەی مـامی پێغەمـبەری



خۆشەویستمان ﷺ دەرچوون بۆ ڕێگە گرتن لە کاروانێکی قورەیش لە شامەوە دەگەڕایەوە کە بە سەرکردایەتی ئەبو جەهل بوو بە ٣٠٠ چەکدارەوە.

٢. سریەی "رابغ" لە شەوالی ساڵی ١ی کۆچیدا بوو، کە تێیدا ٦٠ سواری کۆچەران بە سەرکردایەتی عوبەیدەی کوڕی حارث لە رابغ گەیشتن بە ئەبو سوفیان کە (٢٠٠) کەسی لەگەڵ بوو و بەرامبەر یەکتر بوونەوە تەنها بە وەشاندنی تیر.

٣. غەزای (ئەبوائـ یان وددان) یەکەم جەنگ بوو کە پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ خۆی دەرچوو لەگەڵ هاوەڵان لە صەفەری ساڵی ٢ی کۆچیدا بوو، تێیدا پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی دەرچوو لەگەڵ ٧٠ پیاوی تایبەتی کۆچەران بۆ ڕێگە گرتن لە کاروانێکی قورەیش کە گەیشتبوونە وددان، بەڵام ئەمان پێیان نەگەیشتن.

٤. غەزای "ذیلعوشەیرە(ذي العشیرە)" لە جەمادی یەکەم و جەمادی دووەمی ساڵی ٢ی کۆچیدا ڕوویدا، پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ ١٥٠ کەس یان ٢٠٠ کەس لە کۆچەران دەرچوون و زۆری لە کەس نەکرد بۆ دەرچوون، و ٩ وشتریان پێ بوو بە نۆرە سواری دەبوون، دەیانویست ڕێگە لە کاروانێکی قورەیش بگرن کە بڕە پارەیەکی زۆری قورەیشی تێدا بوو بەرەو شام دەڕۆیشتن.

کاتێک پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ و هاوەڵانی گەیشتنە ذیلعوشەیرە بینیان بە چەند ڕۆژێ پێشتر بەوێدا تێپەڕیوون، و هەر ئەم دەرچوونە بۆ ئەم کاروانە دوای گەڕانەوەیان بووە هۆی ڕوودانی غەزای بەدری گەورە.

٥. سریەی(نەخلە) لە مانگی ڕەجەبی ساڵی ٢ی کۆچی ڕوویدا، تێیدا عەبدوڵڵای کوڕی جەحشی ئەسەدی لەگەڵ ١٢ پیاوی تری کۆچەردا نێردران بۆ ڕێگە گرتن لە کاروانێکی قوڕەیش، کاتێک گەیشتنە نەخلە کاروانێکی قوڕەیش بەوێدا تێدەپەڕی بەردی بە نرخ و شەراب و شتومەکی بازرگانیان پێ بوو. بەڵام ئەو ڕۆژە کۆتا ڕۆژی مانگی ڕەجەب بوو، مانگی ڕەجەبیش لەو مانگانەیە کە شەڕ و کوشتنی تێدا حەرامە، و موسڵمانەکان کەوتنە مشتومڕ لەسەر ئەوەی گەر بەسەریاندا بدەن ئەوا سنووری مانگەکە دەبەزێنن و گەر ئەو شەوە وازیان لێ بێنن ئەوا لە دەستیان دەچێت.

لە کۆتاییە بڕیاریاندا بەسەریاندا بدەن، لە ئەنجامدا عەمڕوی کوڕی حەضرەمی کوژرا و عوثمانی کوڕی عەبدوڵڵای موغیرە و حەکەمی کوڕی کیانیان بە دیل گرت، و نەوفەلی کوڕی عەبدوڵڵای موغیرە هەڵهات، پاشان موسڵمانان بە کاروانەکە و دوو دیلەکەوە گەڕانەوە مەدینە و پێنجیەکیان لێ جیاکردەوە، و یەکەم جیاکردنەوەی پێنجیەک و یەکەم کوژرا و بە دیل گیراو لە ئیسلامدا لە ئەم سریەیەدا بوو.

کە گەڕانەوە پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ ئەم کارەی پێناخۆش بوو و پێیانی فەرموو:

من فەرمانم پێ نەدابوون بە شەڕ کردن لە مانگی حەرامدا، سەبارەت بە کاروان و هەردوو دیلەکە وەستاو و هیچی نەوت.



و هاوەڵـدانەران لەم ڕووداوە دەرفەتێکی باشـیان دەسـتکەوت بـۆ تاوانبـار کردنـی موسـڵمانان بەوەی گـوایە شـتێکیان حەڵاڵ کـرد لە کاتێکـدا خـوای گەورە حەرامی کـردووە، و قسـەیەکی زۆری لەسـەر کـرا، تـا خـوای گەورە ئەم ئـایەتەی نـاردە خوارەوە و ئەو بابەتەی یەکلا کردەوە.

**(يَسْأَلُونَكَ عَنِ الشَّهْرِ الْحَرَامِ قِتَالٍ فِيهِ ۖ قُلْ قِتَالٌ فِيهِ كَبِيرٌ ۖ وَصَدٌّ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ وَكُفْرٌ بِهِ وَالْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَإِخْرَاجُ أَهْلِهِ مِنْهُ أَكْبَرُ عِنْدَ اللَّهِ ۚ وَالْفِتْنَةُ أَكْبَرُ مِنَ الْقَتْلِ......)**[1]

پرسـیارت لێ دەکـەن دەربـارەی مـانگی حـەرام جـەنگ کـردن تیایـدا بڵـێ: جـەنگ لـە مانگی ئاگر بەستدا گوناهێکی گەورەیە بەڵام بەرهەڵستیی ڕێبازی خوا وە بێبڕوایی پێی وە(ڕێ گری موسوڵمانان) لە مزگەوتی حەرام و دەرکردنی خەڵکی ئەو مزگەوتە لێی گـەورەترە لای خوا(لـە جـەنگ کـردن لـە مـانگی حەرامـدا) وە هـەوڵ دان بـۆ پەشیمان کردنەوەی موسوڵمان گەورەترە لە (پیاو) کوشتن (لەو مانگەدا) ...

لێـرە بە ڕوونـی دەرکەوت ئەوەی بێباوەڕەکـان دەیـکەن زۆر گەورەتـرە لەوەی کە موسڵمانەکان کردوویانە.

دوای ئەم سـریەیە ترسـی موشـریکەکان زیـادی کـرد و لە بەردەمیانـدا مەترسـییەکی گەورە و ڕاسـتەقینە بەرجەسـتەبوو و حـورمەت و لـوت بەرزیـان شـکا، و بۆیـان

---

[1] البقره_٢١٧

دەرکەوت شاری مەدینە لە وریاییەکی تەواو بوون و چاودێری هەموو جموجۆڵێکی بازرگانیان دەکرد.

قورەیشییەکان ژیرانە کاریان نەکرد وەکو ئەوەی کە خێڵی بەنو ضمرە و جهنیە ڕێک کەوتن لەگەڵ موسڵمانان، بەڵکو ڕق و کینەیان زیاتر کرد و بڕیاری لەناو بردنی موسڵمانانیاندا.

ماوەیە دوای ئەوە خوای گەورە چەند ئایەتێکی دابەزاند موسڵمانانی فێری شێوازی شەڕ کردن دەکرد و هانیانی دەدا و هەندێک ئەحکامەکانی ڕوونکردەوە.

پاشان سەرکۆنەی ئەو کەسانەی کرد کە بە بیستنی فەرمانی شەڕ دڵیان دەکەوتە لەرزە و فەرمووی: (......فَإِذَا أُنْزِلَتْ سُورَةٌ مُحْكَمَةٌ وَذُكِرَ فِيهَا الْقِتَالُ ۙ رَأَيْتَ الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ مَرَضٌ يَنْظُرُونَ إِلَيْكَ نَظَرَ الْمَغْشِيِّ عَلَيْهِ مِنَ الْمَوْتِ......)[1] واتە: کاتێ سورەتێکی ڕوون و دامەزراو نێرابێتە خوارەوە و تێیدا باسی جەنگ کرابێ دەبینی ئەو کەسانەی کە لە دڵیاندا نەخۆشی (دوو ڕوویی) هەیە تەماشای تۆ دەکەن وەک تەماشا کردنی کەسێک کە لە ترسی مردن لە هۆشی خۆی چووبێت.....

[1] مُحَمَّد_٢٠



## گۆڕینی ڕووگە (قیبلە)

دوای ١٦ یان ١٧ مانگ لە ڕۆیشتنی پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ بۆ مەدینەی پیرۆز خوای گەورە ڕووگەی موسڵمانانی لە بەیتولمەقدەسی شامەوە گۆڕی بۆ بەیتولحەرامی مەککە و پێغەمبەری خوا ﷺ خۆیشی پێی خۆش بوو کە بەیتولحەرام ڕووگەی بێ، و خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: (قَدْ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي السَّمَاءِ ۖ فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبْلَةً تَرْضَاهَا ۚ فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ ۚ وَحَيْثُ مَا كُنْتُمْ فَوَلُّوا وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُ ۗ وَإِنَّ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ لَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ الْحَقُّ مِنْ رَبِّهِمْ ۗ وَمَا اللَّهُ بِغَافِلٍ عَمَّا يَعْمَلُونَ) البقره_١٤٤

بە ڕاستی ئێمە گەڕانی ڕووخسارت ڕوو بە ئاسمان دەبینین دەی سوێند بە خوا ڕووت دەکەینە ڕووگەیەک کە پەسەندت بێ ئیتر ڕووت وەرچەرخێنە بەرەو لای کەعبە (مسجد الحرام) ئێوەش موسڵمانان لە هەر لایەک بوون (لە نوێژدا) ڕووتان بکەنە ئەوێوە(مسجد الحرام) بە ڕاستی ئەوانەی پەڕاویان پێدراوە چاک دەزانن کە ئەمە شتێکی ڕاستە لە پەروەردگاریانەوە، وە خوا بێ ئاگا نییە لەوەی کە دەیکەن.

و یەکەم نوێژ دوای گۆڕینی ڕووگە ئەنجامدرا نوێژی عەسر بوو.

جولەکە و گاورەکان پێیان خۆش بوو کە پێغەمبەری خۆشەویستمانیش ﷺ ڕووی دەکردە بەیتولمەقدەس، کاتێک ڕووی کردە کەعبەی پیرۆز هەموویان ڕەخنەیان لێ گرت.



## کاروانەکەی ئەبو سوفیان و ئامادەکردنی سوپای بێباوەڕان بۆ جەنگ

هەواڵیان بە پێغەمبەر دا ( ﷺ ) کە کاروانێک بە بڕێک پارەی زۆرەوە لە مەککەوە بەرەو شام بەڕێ کەوتووە، ئەمانیش چوونە دەرەوە تاکو ڕێی لێ بگرن، بەڵام لە دەستیان چوو و گەڕانەوە بۆ مەدینە، تا ئەو کاتەی هەواڵی گەڕانەوەیانی لە شامەوە بیست ئەمجارە دوو پیاوی نارده سەر ڕێگای گەڕانەوەی ئەو کاروانە تا گەر بینیان دەستبەجێ ئاگاداریان بکەنەوە، هەر بەو جۆرەش بوو لە کاتی گەڕانەوەی کاروانەکە دەستبەجێ گەڕانەوە لای پێغەمبەر(ﷺ ) تا هەواڵەکەی پێ ڕابگەیەنن.

پێغەمبەری خودا (ﷺ ) ڕوویکردە خەڵکی و فەرمووی: ئەوە کاروانی قورەیش ماڵ و سامانی ئێوەی تێدایە بۆیان بڕۆنە دەر بەڵکو خودا بیکاتە دەست کەوت بۆتان، موسڵمانان کۆبونەوەوە و دەرچوون بۆیان، ئەبو سوفیان بەوەی زانی و هەواڵی نارد بۆ مەککە مەترسی سەر کاروانەکەی پێی ڕاگەیاندن، دوای ئەوەی قورەیشییەکان مەترسی سەر کاروانە بازرگانییەکەیان زانی بە خێرایی سوپایەکیان ئامادە کرد بە سەرکردایەتی ئەبو جەهل زۆربەی هۆزەکانی مەککە بۆ شەڕ دەرچوون، لە سەرەتادا ژمارەیان نزیکەی ١٣٠٠ شەڕکەر بوو، بەڵام دواتر بەهۆی درووستبوونی دووبەرەکی لە نێوانیاندا لەسەر مانەوە یان شەڕ کردن ئەخەنەس و کوڕەکانی و بەنی زوهرە گەڕانەوە مەککە و بەشداری شەڕیان نەکرد، کە

ژمارەیان نزیکەی ٣٠٠ کەس دەبوون و بەو شێوەیە نزیکەی ١٠٠٠کەس مانەوە و بەشداری شەڕی بەدریان کرد .

ئەبو سوفیان بە وریاییەوە کاروانەکەی ئاڕاستە دەکرد، کاتێک هەستی بە نیگەرانی کرد بڕیاریدا ئاڕاستەی کاروانەکە بگۆڕێت بۆ ڕێگایەکی تر بەم شێوەیە کاروانەکەی لە چنگی لەشکەرەکەی مەدینە ڕزگار کرد، ئیتر ئەم هەواڵەی گەیاندەوە بە قورەیش و ئەوانیش بڕیاری گەڕانەوەیان دا، جگەلە (ئەبو جەهل) کە گەڕانەوەی ڕەت کردەوە تاکو سێ ڕۆژ لە بەدر بمێننەوە و ئاهەنگ بگێڕن و ترس و بیم بخەنە دڵی مسوڵمانانەوە، ئەوانیش بەوە ڕازی بوون تەنها (بەنی زوهرە) نەبێت کە بڕیاری گەڕانەوەیان دا.



## یەکەم جەنگی یەکلاکەرەوەی موسڵمانان

## جەنگ (غەزا)ی بەدری گەورە:-

لە ڕۆژی ١٧ی مانگی ڕەمەزانی ساڵی دووەمی کۆچیدا ڕوویدا، هۆکارەکەشی ئەوە بوو کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) هاوەڵانی ڕاسپارد ڕێ بگرن بە کاروانێکی قوڕەیشییەکان کە لە شامەوە بەرەو مەککە دەگەڕایەوە، مەبەستیشی جەنگ نەبوو، بەڵام کاروانەکە ڕزگاریان بوو کە بە سەرکردایەتی (ئەبو سوفیان) بوو، دوای ئەوەی هەواڵی نارد بۆ قوڕەیش هەتا بۆ پاراستنی کاروانەکە بێن بە دەمیانەوە، قوڕەیشیش بە نزیکەی ١٣٠٠ جەنگاوەر دەرچوون بۆ شەڕکردن کە کە ٦٠٠ جەنگاوەریان قەڵغانیان پۆشیبوو و ١٠٠ جەنگاوەریان ئەسپیان پێ بوو و قەڵغانیشیان لەبەر بوو، ژمارەیەک ئافرەت و دەف ژەنیشیان لەگەڵ خۆیان برد بۆ بەرز کردنەوەی ورەیان، و ژمارەیەکی زۆر وشتریشیان پێ بوو کە بە وردی نازانرێت چەندە، بە ڕادەیە زۆر بوو ڕۆژانە ٩ یان ١٠ دانەیان لێ سەر دەبڕی.

موسڵمانانیش ژمارەیان ٣١٣ یان ١٤ پیاو بوو، زۆربەیان لە پشتیوانان بوون، ٧٠ وشتر و تەنها ٢ یان ٣ ئەسپیان پێ بوو، چەند کەسێک پێکەوە یەک وشتریان پێ بوو و هەرجارەو یەکێکیان سەردەکەوتن، پێش ئەوەی جەنگەکە دەست پێبکات پێغەمبەر (ﷺ) ویستی سەبارەت بە چوونە نێو جەنگەوە ڕاوێژ بە هاوەڵانی بکات، بە تایبەت پشتیوانان، ئەوە بوو کۆچەران بۆچوونیان وابوو بچنە نێو جەنگەکەوە و لەو بارەوە ئەوەی قسەی خێر و چاک بوو وتیان، ئینجا پشتیوانان زانییان

پێغەمبەر (ﷺ) مەبەستیەتی ڕای ئەوان وەربگرێت، بۆیە (سەعیدی کوڕی موعاذ) کە گەورەی هەموو پشتیوانان بوو، فەرمووی:

ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئێمە باوەڕمان پێ هێناویت و بە ڕاستمان زانیویت و شایەتیش دەدەین ئەوەی هێناوتە حەقە، لەسەر ئەمەش بەڵێن و پەیمانی گوێڕایەڵیمان پێداویت، دەی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) چیت پێ باشە هەنگاوی بۆ بنێ، ئێمەش لەگەڵتین، سوێند بەوەی تۆی بە حەق ناردووە ئەگەر تاومان بدەیتە ناو ئەو دەریایە لەگەڵتدا خۆمانی لێ دەدەین و یەک کەسمان دواناکەوێت، پێمان ناخۆش نیە سبەینێ بەرەنگاری دوژمنمان ببینەوە، ئێمەش لە کاتی جەنگدا خۆڕاگرین و لە کاتی گەیشتن بە دوژمندا ڕاستگۆین، لەوانەیە خوای گەورە لە ئێمەوە هەڵوێستێکت پێ نیشان بدات کە چاوەکانت پێی فێنک ببنەوە، دەی لەسەر بەرەکەتی خوا فەرمانمان پێ بکە، و کۆمەڵێ قسەی تری کرد و پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی دڵخۆش بوو،

دواتر پێغەمبەری خۆشەویستمان (ﷺ) فەرمووی:

لەسەر بەرەکەتی خوا بەڕێبکەون و دڵخۆش بن، چونکە خوای گەورە بەڵێنی یەکێک لەم دووانەی پێداوم:

یا کاروانەکە یان نەفیر (سوپاکە).

ئینجا پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەڕێکەوت هەتا گەیشتە خوارووی ئاوێک لە بەدر و لەوێ دابەزی، (حوبابی کوڕی مونضیر) فەرمووی:



ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەم شوێنە بە فەرمانی خوا تیایدا دابەزیویت و پێش و دوای تێدا نیە؟ یان ئەمە ڕاو بۆچوون و فێڵ و پلانی جەنگە؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بەڵکو ڕاو بۆچوون و فێڵ و پلانی جەنگە.

ئینجا (حوباب) پێشنیاری کرد پێغەمبەری خوا (ﷺ) بچێت بۆ شوێنێکی گونجاوتر کە موسڵمانان بتوانن ئاوی بەدر لە بێباوەڕەکان ببڕن، پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵانی هەستان و چوونە ئەو شوێنەی (حوباب) ئاماژەی پێدابوو لەوێ سەقامگیر بوون.

کاتێک هەردوو سوپا بەیەکگەیشتن پێغەمبەر (ﷺ) ڕیزەکانی موسڵمانانی ڕێکدەخست و هانیدەدان لەسەر جەنگ و تاسەی شەهیدی لا زیاتر دەکردن و فەرمووی (والذي نفسي بيده، لا يقاتلهم اليوم رجل، فيقتل صابرا محتسبا مقبلا غير مدبر، الا ادخله الله الجنة).

واتە: (سوێند بەوەی گیانمی بە دەستە، هەر کەسێک ئەمڕۆ لەگەڵیاندا بجەنگێت و خۆڕاگرانە و لە چاوەڕوانی پاداشتی خوادا ڕووەو پێش پێشڕەوی بکات و ڕوو وەرنەگێڕێت، بەو چەشنە بکوژرێت، ئەوە بە دڵنیاییەوە خوای گەورە دەیخاتە بەهەشتەوە).

ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) هاودەم بە ئەبو بەکر گەڕایەوە ناو عەریشەکەی و (سەعدی کوڕی موعاذیش) شمشێری هەڵکردبوو و پاسەوانیی پێغەمبەری خوای (ﷺ) دەکرد، ئینجا پێغەمبەر ﷺ دەستی کرد بە نزاکردن، بەشێکی نزاکەی ئەمە بوو:

(اللهم إني أنشدك عهدك ووعدك، اللهم إن تهلك هذه العصابة لا تعبد في الأرض). واتە: (خوایە داوات لێ دەکەم بەڵێن و پەیمانەکەت بەجێبگەیەنیت، خوایە ئەگەر ئەم تاقمە (باوەڕدارە جەنگاوەرەکان) لەناو بچن ئەوە ئیتر لەسەر زەویدا ناپەرسترێیت).

پێغەمبەری سەروەرمان (ﷺ) درێژەی بە سوجدەکانی دەدا هەتا ئەبو بەکر پێی فەرموو: هێندە بەسە، دڵنیابە خوای گەورە بەڵێنەکەت بۆ بەجێدەگەیەنێت.

دوای ئەوەی ئەسوەدی کوڕی عەبدولئەسەدی مەخزوومی کە کابرایەکی توونـدوتیژی بەدڕەوشت بوو لە ئۆردوگای قوڕەیشییەکان ڕۆشت و وتی: لەگەڵ خوای خۆم پەیمانم بەستووە کە یان ئەوەتا لە ئاوی حەوزەکان بخۆمەوە و تەخت و تاراجیان دەرێنم، یان ئەوەتا لەو ڕێگەیە بمرم و نەگەڕێمەوە.

هەر کە هاتە مەیدانەکە لەگەڵ حەمزە ڕووبەڕووی یەکتری بوونەوە و حەمزە کوشتی. ئەوە یەکەمین کوژراوی جەنگەکە بوو کە بووە هۆی گەرم کردنی جەنگەکە.

دوای ئەوە سێ پیاوی تری قوڕەیش کە هەر هی یەک بەرەباب بوون عوتبە و شەیبەی کوڕانی ڕەبیعە لەگەڵ وەلیدی کوڕی عوتبە هاتنە مەیدانەکە و داوای ڕووبەڕوو بوونەوەیان کرد، سێ تازە لاوی پشتیوانان بە ناوەکانی عەوف و موعەوەذی کوڕانی حاریث و عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە چوونە پێشەوە.

وتیان ئێوە کێن؟



وتیان: ئێمە تاقمێکین لە پشتیوانان.

وتیان: ئێوە ڕێزدارن لای ئێمە کارمان بە کاری ئێوەوە نیە ئێمە مامۆزاکانی خۆمان دەوێت.

پاشان یەکێک لەوان هاواری کرد هۆ موحەممەد لە خزم و کەسوکاری خۆمان بۆ بنێرە.

پێغەمبەری خودا (ﷺ )فەرمووی هەستە عوبەیدەی کوڕی حاریث، هەستە حەمزە، عەلی هەستە.

بەم جۆرە عوبەیدە کە لە هەموویان بە تەمەنتر بوو ڕۆیشتە بەرامبەر عوتبە و حەمزەش چووە بەرامبەر شەیبە و عەلیش وەلیدی بۆ مایەوە.

حەمزە و عەلی ڕاستەوخۆ لەشیان بۆ خەڵتانی خوێن کردن بەڵام عوبەیدە و نەیارەکەی لێکیان دا و یەکتریان بریندار کرد، پاشان عەلی و حەمزە چوون و عوتبەیان کوشت و عوبەیدەشیان بە برینداری هێنایەوە، عوبەیدە هەر بە برینداری مایەوە و دوای ٤ بۆ ٥ ڕۆژ وەفاتی کرد. ئیمام عەلی سوێندی دەخوارد کە ئەم ئایەتە دەرهەقی خۆی و حەمزە و عوبەیدە دابەزیووە (هَٰذانِ خَصمانِ اخْتَصِموا فِي رَبِّهِم).

ئینجا جەنگەکە گەرم بوو و بە سەرکەوتنی موسڵمانان کۆتایی هات، لە موسڵمانەکان ١٤ کەس شەهید بوون، ٦ کۆچەری و ٨ پشتیوان بوون. و نزیکەی ٧٠ بێباوەڕ کوژران، لە نێوانیاندا بێباوەڕترین کەسیان کە ئەبو جەهل بوو لەگەڵ

هەندێ سەرکردەی تریان کوژران، نزیکەی ٧٠ کەسیشیان بە دیل گیران، ئینجا فەرمان کرا هەموو کوژراوەکان ئەسپەردە بکرێن، پاشان پێغەمبەر (ﷺ) سەبارەت بە دیلەکان ڕاوێژی بە هاوەڵانی کرد، عومەر پێشنیاری کرد بیانکوژن، ئەبو بەکر پێشنیاری کرد بە فیدیە (وەرگرتنی بڕێک پارە لە بری بری کەسێک) ئازادیان بکەن، پێغەمبەر (ﷺ) پێشنیارەکەی ئەبو بەکری پەسەند کرد و لە بری بڕێک پارە دیلە بێباوەڕەکانی ئازاد کرد.

چەند ئایەتێکی قورئانی پیرۆز سەبارەت بە جەنگی بەدر دابەزین، خوای گەورە لە سوڕەتی (ئالی عیمران)دا دەفەرمووێت: ( وَلَقَدْ نَصَرَكُمُ اللَّهُ بِبَدْرٍ وَأَنتُمْ أَذِلَّةٌ ۖ فَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ (١٢٣) إِذْ تَقُولُ لِلْمُؤْمِنِينَ أَلَن يَكْفِيَكُمْ أَن يُمِدَّكُمْ رَبُّكُم بِثَلَاثَةِ آلَافٍ مِّنَ الْمَلَائِكَةِ مُنزَلِينَ (١٢٤) بَلَىٰ ۚ إِن تَصْبِرُوا وَتَتَّقُوا وَيَأْتُوكُم مِّن فَوْرِهِمْ هَٰذَا يُمْدِدْكُمْ رَبُّكُم بِخَمْسَةِ آلَافٍ مِّنَ الْمَلَائِكَةِ مُسَوِّمِينَ (١٢٥) وَمَا جَعَلَهُ اللَّهُ إِلَّا بُشْرَىٰ لَكُمْ وَلِتَطْمَئِنَّ قُلُوبُكُم بِهِ ۗ وَمَا النَّصْرُ إِلَّا مِنْ عِندِ اللَّهِ الْعَزِيزِ الْحَكِيمِ (١٢٦) لِيَقْطَعَ طَرَفًا مِّنَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَوْ يَكْبِتَهُمْ فَيَنقَلِبُوا خَائِبِينَ).

واتە: (بێ سۆ لە ڕۆژی (بەدر)دا خوا بەسەر دوژمندا سەریخستن، و ئێوە ناتەواو و کەم و بێ دەسەڵات و کزو لاوازیش بوون، دەسا هەر لە خوا بترسن و خۆبپارێزن، بەڵکو بتوانن سوپاسی بکەن ✸ ئەو دەمە بە بیر بێنە ئەی پێغەمبەر کە بە باوەڕدارەکانت دەگوت: ئاخۆ ئەوەندەتان بەس نەبێ کە پەروەردگارت لە



فریشتەکانی خۆی سێ هەزار بنێرێتە خوارێ بۆ هاوکاریتان ✸ بەڵێ ئەو ئەندازەیە بەسە، ئەگەر ئێوە خۆڕاگربن و لە سنورەکانی خوا پارێز بکەن و خۆ لەم کاتەدا پەلامارتان بدەن پەروەردگارتان بە پێنج هەزار فریشتەی نیشانەدار کۆمەکتان دەکات ✸ خوای کارجوان ئەوەیشی هەر بۆ ئەوە کرد ببێتە مژدەیەک بۆ ئێوە و پێیشی دڵنیاو بە ئارامبن، ئەگینا خۆ سەرکەوتن تەنها بەدەستی خوای باڵادەست و کارجوانە ✸ خوا ویستی لەو ڕۆژەدا بەشێ لە بێباوەڕان لەناو ببات، ئەوەبوو یان بۆ ئەوە بیانشکێنێ و ڕیسوایان بکات ئەگەر نەکوژران، ئەوجا بە نائومێدیی و خەجاڵەتەوە بگەڕێنەوە).

هەروەک سەبارەت بە سەرکۆنەکردنی پێغەمبەر (ﷺ) ئایەت دابەزی و لەسەر ئەوە سەرکۆنەی کرد کە بۆچی ڕازی بووە دیلەکان بە فیدیە ئازاد بکات، خوای گەورە دەفەرموویت:

مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُ أَسْرَىٰ حَتَّىٰ يُثْخِنَ فِي الْأَرْضِ ۚ تُرِيدُونَ عَرَضَ الدُّنْيَا وَاللَّهُ يُرِيدُ الْآخِرَةَ ۗ وَاللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ (٦٧) لَّوْلَا كِتَابٌ مِّنَ اللَّهِ سَبَقَ لَمَسَّكُمْ فِيمَا أَخَذْتُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ (٦٨) فَكُلُوا مِمَّا غَنِمْتُمْ حَلَالًا طَيِّبًا ۚ وَاتَّقُوا اللَّهَ ۚ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ(٦٩).

(بە هیچ پەیامبەرێک ڕێ نەدراوە کە دیلی هەبێ و دیل ڕاگرێ، یان بریتی وەرگرێ هەتا هێز و دەسەڵات بە دەست دەگرێت ئێوە دەتانەوێ لەززەت و کاڵای دونیاتان دەسکەوێ لە وەرگرتنی بریتیدا خوایش پاشە ڕۆژی ئەوێ بۆتان، خوا بۆ خۆی زۆر



بە دەسەڵات و زۆریش کارجوانە، ئەگەر پێشتر لە خواوە بڕیار دەرنەچووبا کە، سزای هەڵەکار _بە ئیجتیهاد_ نەدات، لەو بریتی وەرگرتنەتاندا سزایەکی گەورەتان دووچار دەبوو و قاری لێدەگرتن ✹ دەسا لەو دەسکەوتەی گرتووتانە بخۆن بە حەڵاڵی و پاکی وە لەخوا بترسن، بەڕاستی خوا زۆر لێبوردەیە، زۆر دلۆڤان و میهرەبانە).[1]

---

[1] [الأنفال: ٦٧-٦٩].



## گەیشتنی هەواڵی ئەنجامی جەنگەکە بۆ مەککە و مردنی ئەبولەهەب

دوای کۆتـایی هـاتنی جەنگی بەدر ئەوەی تـوانی هەڵبێـت هەرکەسـەو بەلایەکـدا ڕۆیشتن بۆ ڕزگاربوونیان، حسیمانی کوڕی عەبدوڵلا یەکەم کەس بوو گەیشتەوە مەککەی پیرۆزی هەواڵی ئەنجامی جەنگەکەی پێیـان ڕاگەیانـد و ئەبـو لەهەب و تەواوی بێباوەڕان تەواو بێزار و ماندوو بوون و موسڵمانان زۆریان پێ خۆش بوو.

و دوای ئەمە ئەبـو لەهەب تەنهـا حەوت شـەو ژیـا، خـوای گەورە تووشـی گەڕی(نەخۆشـییەکی پێسـتییە) کـرد و بەهـۆیەوە مـرد، تـا سێ ڕۆژ کەس نزیکی تەرمەکەی نەکەوت و کوڕەکانیشی وازیان لێ هێنا و کەسیش هەوڵی نەدا بینێژێت.

دواتر کوڕەکانی لەبەر قسەی خەڵکی هەستان چاڵێکیان بـۆی هەڵکەنـد و بە دار تەرمەکەیـان خسـتە نـاو چـاڵەکەوە و لە دوورەوە خۆڵیـان بـۆی دەوەشـاند تـا بە تەواوی دایانپۆشی.

## پڕوپاگەندەی جولەکە وگاورەگان وگەیشتنی هەواڵی ئەنجامی جەنگەکە بۆ مەدینە:

کە خوای گەورە سەرکەوتنی بەخشی بە موسڵمانان پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە و زەیدی کوڕی حاریثەی نارد بۆ گەیاندنی موژدەی سەرکەوتن بۆ خەڵکی مەدینە.

جولەکە و گاورەکانیش پڕوپاگەندەی درۆیان بڵاو دەکردەوە لە مەدینە و ئەوەشیان بڵاو دەکردەوە کە گوایە پێغەمبەری خوا ﷺ شەهید کراوە.

کاتێک یەکێک لە دوو ڕووەکان زەیدی کوڕی حاریثەی بینی بە سواری (قصوائ)ەوە بەرەو مەدینە دێ، وتی:

ئەرێ واللە موحەممەد کوژراوە، ئەوەش (قصوائ)ی وشترەکەیەتی(وشترەکەی پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ)، و ئەوەش زەیدە لە ترساندا نازانێت چی بڵێت و سەری شۆڕ کردووە و شکاوە.

دوای گەیشتنی موژدەدەرەکان خەڵکی مەدینە لە دەوریان کۆ بوونەوە و بە بیستنی هەواڵەکە زۆر دڵخۆش بوون، و هەموو لایەکی مەدینە پڕ بوو لە وتنی:

(لَاْ إِلَٰهَ إِلَّاْ الله و اللّٰهُ أَكْبَر ).

و لەو کاتەی موژدەکەیان پێ گەیشت عوثمانی کوڕی عەففان و ئوسامەی کوڕی زەید خەریکی ئەسپەردە کردنی ڕوقەیەی کچی پێغەمبەری ئەزیزمان □ ﷺ بوون،



کە هاوسەری عوثمان بوو، و لەسەر فەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ لەلای ڕوقەیە مابوونەوە.

## نەجاشی بە ئەنجامی غەزای بەدردڵخۆش دەبێ

کاتێک لە ڕێگەی هەواڵنێرەکانی نەجاشییەوە هەواڵی سەرکەوتنی موسڵمانان لە غەزای بەدر گەیشتە نەجاشی زۆر پێی دڵخۆش بوو و موسڵمانە کۆچەرەکانی کۆکردەوە و هەواڵەکەی پێیان گەیاند، و کە ئەوان هاتن بینیان نەجاشی پۆشاکێکی کۆنی پۆشیوە و لەسەر خۆڵ دانیشتووە، و ئەمانیش زۆر بەزەییان پێی هاتەوە و جەعفەر خوای گەورە لێی ڕازی بێ لێی پرسی بۆ حاڵی بەو شێوەیە، ئەویش فەرمووی:

لە کتێبەکەی ئێمە کە خوای گەورە بۆ عیسا(سەلامی خوای گەورەی لێ بێ) ناردووەتە خوارەوە هاتووە پێویستە لەسەر بەندە هەر کاتێک خوای گەورە نیعمەتێکی پێ بەخشین ئەوان خۆ بە کەم زانین نیشان بدەن بۆ خوای گەورە، وە کاتێک خوای گەورە ئەم سەرکەوتنەی بەخشییە پێغەمبەرەکەی ﷺ منیش ئەم خۆ بە کەم زانینەم نیشاندا بۆ خوا.

## پلەی ئەو موسڵمانانەی کە لە جەنگی بەدردا بەشدارییان کرد

لە ئەم باسەدا دوو فەرموودەی سەروەری مرۆڤایەتی ﷺ باس دەکەین، تێیاندا دەفەرموێت:

هەرگیز ناچێتە ناو ئاگری دۆزەخەوە پیاوێک بەشداری کردبێت لە بەدر یان لە حودەیبییەدا.

و لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرموێت:

خوای گەورە تەماشای بەشداربووانی شەڕی بەدری کرد و پێیانی فەرموو:

ئەو کارەی پێتان خۆشە ئەنجامی بدەن، چونکە من لە هەمووتان خۆش بووم.



## چەند چالاکییەک لە چالاکییە سەربازییەکانی نێوان جەنگی بەدرو ئوحود

غەزای بەدر یەکەم ڕووبەڕووبوونەوە بوو لە نێوان موسڵمانان و هاوەڵدانەران، و جەنگێکی یەکلاکەرەوە بوو.

ڕێز و شکۆیەکی زۆری بەخشی بە موسڵمانان و بۆ هاوەڵدانەران و بێباوەڕان بە پێچەوانەوە بوو، بۆیە بە ڕادەیەکی زۆر ڕق و کینەیان لە دڵ هەڵگرت بەرامبەر موسڵمانان و بە هەموو شێوەیە هەوڵی تۆڵە کردنەوەیان دەدا.

**لێرەدا باس لە دوو چالاکی دەکەین پشتیوان بە خوای گەورە:**

یەکەم چالاکی دوای غەزای بەدر غەزای بەنی سەلیم بوو لە کدر، هەواڵگرەکانی مەدینە هەواڵیان گەیاند بە پێغەمبەری خوا ﷺ کە تیرەی بەنی سەلیم لە ناو خێڵی غەطفاندا هێزەکانیان کۆ دەکەنەوە بۆ ئەوەی هەڵبکوتنە سەر شاری مەدینە، بۆیە پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ بە دوو سەد سوارەوە لەناکاو بەسەری ئەو تیرەیەیان دا لە کدر و لە ناو جێگاکەی خۆیاندا شپرزەیانی کرد، جا ئەوان فریا نەکەوتن و هەڵهاتن و ٥٠٠ وشتر و ژێردەستەیەکیان بەجێهێشت، پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ ژێردەستەکەی ئازاد کرد و دوای جیاکردنەوەی پێنج یەکی دەستکەوتەکان ئەوەی مایەوە دابەشی کرد بەسەر بەشداربووانی غەزاکە.

چالاکییەکی تریان پیلانێک بوو بۆ کوشتنی پێغەمبەری خوا ﷺ، ڕۆژێکیان عومەیری کوڕی وەهەب کە یەکێک بوو لە پیاوە شەیتانەکانی قورەیش و زۆر ئازاری پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ و هاوەڵانی دەدا لەگەڵ صەفوانی کوڕی

ئـومەیە لە پـاڵ کەعـبەی پیـرۆزدا دانیشـتبوون و باسـی ڕووداوەکانیـان دەکـرد و وەهەبی کوڕی عـومەیریش لەلای موسڵمانان بە دیل گیرابوو، عـومەیر وتی سـوێند بە خــوا گەر ئەو قەرزانەم لەســەر نەبــووایە و مــاڵ و منــداڵەکانم نەبــووایە کە دەترسم بمرن، ئێستا سـوار دەبووم دەچووم موحەممەدم دەکوشـت، بیانووشـم هەیە کوڕەکەم لەلای ئەوان دیلە.

صەفوانیش ئەمەی بە هەل زانی و وتی:

من قەرزەکەت دەدەمەوە و خێزانەکەشت لەگەڵ خێزانەکەی خۆم دەبن.

عومەیر پێی وت:

با ئەم باسەیە لە نێوان من و تۆدا بێت.

وتی: باشە.

عـومەیر فەرمانی کـرد شمشێرەکەی بۆ ژەهـراوی بـکەن و کەوتە ڕێ بەرەو مەدینە، کە گەیشتە ئەوێ عومەڕی کوڕی خەطاب بینی و فەرمووی:

ئەوە عـومەیرە سـەگی دوژمنی خودایە، بۆ شـەڕ نەبێت هیـچی تری بەدەستەوە نییە، و هەواڵەکەی بە پێغەمـبەری ئەزیزمـان ﷺ گەیانـد و ئەویـش فەرمـووی بـا بێـتە ژوورەوە.

عـومەڕ بە قایشی شـمشێرەکەی دەسـتبەسـتی کـرد و بە پیـاوێکی پشـتیوانانی فەرموو بڕۆنە ژوورەوە و ئاگاتان لە پێغەمبەری خوا ﷺ بێ.

کە ڕۆیشتە ژوورەوە بەو شێوەیە پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ فەرمووی:



عومەیر دەستی بکەوە.

و دەستیان بە قسەکردن کرد و عومەیر بەردەوام بە درۆ وڵامی پێغەمبەری خوای دەدایەوە ﷺ، و ئەویش فەرمووی:

نەخێر وا نییە، و باسی گفتوگۆکەی نێوان خۆی و صەفوانی بۆی کرد و لە کۆتاییە فەرمووی:

دڵنیاشبە خودا ناهێڵێت تۆ من بکوژیت.

عومەیر وتی:

شایەتی دەدەم کە تۆ پێغەمبەری خوایت، پێغەمبەری خوا ئێمە هەموومان بە درۆمان دەخستیتەوە کە تۆ هەواڵت لە ئاسمانەوە پێدەگەیشت و نیگات بۆ دەهات، ئەم بابەتە تەنها لە نێوان من و صەفواندا بوو، واللەی ئەم هەواڵە جگەلە خودا کەس بە تۆی نەگایاندووە.

و کۆمەڵێ قسەی تری کرد و موسڵمان بوو و دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ بە هاوەڵانی فەرموو:

براکەتان تێبگەیەنن لە ئاینەکەی و فێری قورئان خوێندنی بکەن و دیلەکەشی بۆ بەربدەن.

صەفوانیش لە مەککە بەردەوام موژدەی بە خەڵکی دەدا کە لە ماوەیەکی نزیکدا هەواڵێکی خۆشیان پێ دەگات و تۆڵەی بەدریان پێ لە بیر دەباتەوە، و هەموو

جارێک پرسیاری عومەیری لە ڕێبواران دەکرد تا یەکێکیان هەواڵی موسڵمان بوونی پێی گەیاند، و ئەویش سوێندی خوارد کە قسەی لەگەڵدا نەکات و هیچی نەداتێ.

و عومەیر هاتەوە بۆ مەککە و لەوێ مایەوە و بانگەوازی دەکرد بۆ ئیسلام و لەسەر دەستی زۆر کەس موسڵمان بوون.

جگەلە ئەمانە چەندین چالاکی تر ڕوویاندا لە نێوان جەنگی بەدر و ئوحددا، یەکێک لەو چالاکییانەی کە کاریگەرییەکی زۆر خراپی بەسەر قوڕەیشییەکانەوە هەبوو سریەکەی زەیدی کوڕی حاریثە بوو، کە بە سەرکەوتووی دەستیان گرت بەسەر کاروانێکی زۆر باشی قوڕەیشییەکان.



## غەزای ئوحود

وەکو پێشتر باسکرا هاوەڵدانەران و بێباوەڕان بەرگەی شکستەکەی جەنگی بەدریان نەگرت و دوای ئەوە چەند سرییە و غەزایەکی تریش ڕوویاندا بەهەمان شێوە کەمەر شکێن بوو بۆیان بە تایبەت سریەکەی زەیدی کوڕی حاریثە، بۆیە تەواو خۆیان پڕ چەک کرد و تەواوی ئەو شتانەی کە لە کاروانەکەی پێش غەزای بەدر ڕزگاری بوو بەکاریان هێنا بۆ خۆ ئامادە کردن و بە ٣٠٠٠ هەزار کەسەوە دەرچوون بۆ جەنگی ئوحد و ٢٠٠ ئەسپیشیان پێ بوو، ئەمجارە ئافرەتانیشیان لەگەڵ خۆیان برد بۆ بەرز کردنەوەی ورەیان یەکێک لەو ئافرەتانە هیندی کچی عوتبەی هاوسەری ئەبو سوفیانی سەرکردەیان بوو.

موسڵمانانیش خۆیان ئامادە کرد بۆ جەنگەکە، لەبەر پەرۆشییان بۆ ئەو پاداشتەی بەشداربووانی جەنگی بەدر بەدەستیان هێنا لەلای خوای گەورەوە، هاوەڵان بە گەورە و بچووک و کەمئەندامیشەوە پێشبڕکێیان دەکرد بۆ بەشداری کردن لە جەنگەکە و شەهید بوونیان، و پێغەمبەری خوا ﷺ چەندین کەسیانی ڕەت کردەوە لەبەر کەمی تەمەنیان یەکێک لەوانە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر بوو.

و پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ پێش دەرچوونیان خەونێکی بینی و بۆ هاوەڵانی باس کرد و لێکدانەوەی خەونەکەشی بۆیان باس کرد.

و بە هاوەڵانی فەرموو ئەمجارە بۆ جەنگ نەڕۆنە دەرەوە و گەر دوژمنان هەڵیان کوتایە سەر مەدینە ئەوان هاوسەر و منداڵەکانیان لە ماڵەکانیان دابنێن و شەڕی



کۆڵان بە کۆڵان لەگەڵ بێباوەڕان بکەن و ئافرەتەکانیش لەسەر بانەکانەوە تیر بارانیان بکەن.

بەڵام زۆربەی هاوەڵان ڕازی نەبوون، کۆمەڵێکی زۆریان لەبەر پەرۆشییان بوو بۆ شەهید بوون، بۆ نموونە ئەوانەی جەنگی بەدریان نەبینی بوو دەیان وت سوێند بە خوا ئەوان لە کاتی نەفامیدا نەیانتوانی بێنە سەرمان بۆ ناو شار، ئەی ئێستا چۆن دەتوانن بێنە سەرمان دوای موسڵمان بوونمان و کۆمەڵێ شتی تریان فەرموو. بۆیە پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ لەگەڵ ڕای زۆرینە بوو و دەرچوون بۆ شەڕ کردن.

دوای ئەوە هاوەڵان دەستیان کرد بە گفتوگۆ کردن لەسەر ئەم بابەتە و هەموویان پەشیمان بوونەوە و گەڕانەوە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و پێیان فەرموو:

ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ با لە شاردا بمێنینەوە و هەر بۆچوونەکەی تۆ ڕاستە و ئێمەش پشتگیریت لێ دەکەین.

پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ پێیانی فەرموو:

هیچ پێغەمبەرێک بۆی نییە چەکی لە خۆی بەست دایبنێتەوە تا شەڕ نەکات، وە من پێشتر ئەوەم لێ داوا کردن بەڵام ئێوە تەنها بە دەرچوون نەبێت ڕازی نەبوون، لەبەر ئەوە گوێڕایەڵ بن بۆ فەرمانەکانی خوای گەورە، و بە ئارام و خۆڕاگر بن لە کاتی تێکرژانتان لەگەڵ دوژمندا، و ئەوەی فەرمانم پێ کردوون زۆر بە چاکی جێبەجێ بکەن.



پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد خۆیان ئامادە بکەن بۆ دەرچوون لە شار و ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمن.

موسڵمانان بەڕێ کەوتن و لە ڕێگا هێزێکی شەش سەد کەسی پڕ چەکیان بینی بە دوایاندا دەهاتن، پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ فەرمووی ئەوانە کێن؟

فەرموویان ئەوە عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلولە لەگەڵ ٦٠٠ کەس لە جولەکە هاوپەیمانەکانی.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی:

ئایا ئەوان موسڵمان بوون؟

فەرموویان: نەخێر ئەوان لەسەر ئاینی خۆیانن.

پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ فەرمووی:

پێیان بڵێن با بگەڕێنەوە ئێمە پشت بە هاوەڵدانەران نابەستین دژ بە هاوەڵدانەرانی تر.

و سوپای موسڵمانان کاتێک گەیشتنە ناوچەی شواط( شەیخەین) عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی دووڕوو هانی خەڵکی دا بۆ گەڕانەوە و ٣٠٠ کەسی لە خزمەکانی گێڕایەوە لەگەڵ خۆی، و عەبدوڵڵای کوڕی عەمر زۆر ئامۆژگاریانی کرد بەڵام بێ سوود بوو و گوێیان پێی نەدا، و بەم شێوەیە ٧٠٠ کەس مانەوە، دوو کۆمەڵەی موسڵمانان کە ئەمەیان بینی پێی ناڕەحەت بوون ئەوانیش بەنو حاریثە و بەنو سەلەمە بوون.

بەڵام خـوای گەورە دڵی هەردوولایـانی جێگیر و خـۆڕاگر کـرد، و ڕیـزی موسـڵمانانی زیاتر پتەو کرد، و هەرچی دووڕوو هەبوو لە ناویان نەمان.

لە بەرەبەیـانی ڕۆژی شـەممەی ناوەڕاسـتی مـانگی شـەوالی سـاڵی ٣ی کـۆچی سـوپای موسڵمانان گەیشتنە بەرزایی چیای ئوحود.

هێما و وشەی نهێنی نێوان موسڵمانان وشەی" امت امت" بوو، واتە بمرێنە بمرێنە.

موسڵمانان لە خوارووی چیای ئوحـود ڕیز بوون و هاوەڵدانەرانیش لە سەبخە ڕیز بوون، کە زەوییەکی خوێیاوی بوو بەرامبەر چیای ئوحـود و هەردوولا خۆیان ئامادە کرد بۆ شەڕ.

و پێغەمبەری ئەزیزمـان ﷺ ٥٠ تیرهـاوێژی بە توانـای لەسـەر تەپـۆڵکەی عەینەیـن جێگیر کـرد، کە جێگەیەکی تەواو ستراتیژی بـوو بۆ پاراسـتنی سـوپای موسڵمانان و لێـدانی ئەسـپ سـوارەکانی دوژمـن، و فەرمـانی پێیـان کـرد بە هـیچ شـێوەیە جێگەکەیان چۆڵ نەکەن تا ئەو کاتەی خۆی فەرمانیان پێ دەکات.

دوژمنـانیش بە هەمـان شـێوە خەریکی ڕێکخسـتنەوە و خـۆ ئامـادە کـردن بـوون، ئەسپ سوارەکانیان بە لای ڕاست و چەپی سوپاکەیان بڵاو کردەوە.

دوای خۆ ڕێکخستن شەڕ دەستی پێ کرد و هێرشکردنی موسڵمانان بەردەوام بوو و دوژمنان دەستیان کرد بە هەڵهاتن و سەرکەوتنی یەکجاری موسڵمانان زۆر نزیک بـــوو، بەڵام کۆمەڵێـــک لە تیرهاوێژەکـــان لەبەر دەســـتکەوتەکان فەرمـــانەکەی



پێغەمبەری خوایان شکاند ﷺ و جێگاکانیان چۆڵ کرد، وایانزانی کە جەنگ کۆتایی هات و موسڵمانان سەرکەوتوو بوون.

دوای ئەوەی ئەوان شوێنەکەیان چۆڵکرد ئەسپ سوارەکانی قورەیش بە سەرۆکایەتی خالیدی کوڕی وەلید لە جێگاکەی ئەوانەوە هێرشیان کردە سەر موسڵمانان و گەمارۆییانیان دا، و ژمارەیەکی زۆر لە موسڵمانان شەهید و بریندار بوون و ڕیزەکانی سوپای موسڵمان تەواو تێکچوو.

جا یەکێک لەو کاتەدا هاواری کرد و وتی:

بۆیان بگەڕێنەوە بۆیان بگەڕێنەوە، موحەممەد کوژرا.

دەوترێت ئەوەی هاواری کرد ئیبلیسی نەفرەت لێ کراو بووە.

ئەمەش زیاتر موسڵمانانی تووشی پەشۆکان کرد و هەموو بەسەر یەکدا کەوتن و بوونە سێ بەشەوە، بەشێکیان شەڕیان کرد تا شەهید کران و بەشێکیان برینداربوون و بەشەکەی تریشیان هەڵهاتن.

و بە شێوەیەک شپرزە بوون هەندێکیان یەکتریان نەدەناسییەوە، وەکو ئەوەی بەسەر ئەلیەمانی باوکی حوذەیفەدا هات، موسڵمانان لێی کۆ بوونەوە و حوذەیفە کە بینی هەرچەند هاواری کرد ئەی بەندەکانی خوا ئەوە باوکمە ئەوە باوکمە، بەڵام ئەوان بەردەوام بوون و لە شپرزەییە تێنەدەگەیشتن و نەیاندەناسییەوە و کوشتیان.

دواتــر پێغەمــبەری خــوا ﷺ ویســتی پــارەی خــوێنەکەی بــدات بەڵام حــوذەیفە وەرینەگرت و کردیە چاکە بۆ موسڵمانان.

و لەم جەنــگەدا چەنــدین هــاوەڵی زۆر مەرد و بــوێر شــەهید کــران، لەوانەش حەمـزەی مـامی پێغەمـبەری سـەروەرمان ﷺ و ئەنەسـی کـوڕی نەضـر کاتێـک کە تەرمەکەیـان بینییەوە جـێگەی ٨٣ شمشـێر و ڕم و تیری پێـوە بـوو و هـیچ کەسـێک نەیزانــی ئەوە تەنهــا ڕوبەیــعەی خوشــکی نەبــێ، ئەویــش بە ســەرە پەنجەکــانی ناسییەوە.

و لەم جەنگەدا حەمزە خـوای گەورە لێی ڕازی بێ دوای ئەوەی زۆر مەردانە شـەڕی کـرد و دژی دوژمنــان وەســتایەوە بە دەســتی وەحشــی شــەهید کـرا کە کـۆیلەی جـوبەیری کـوڕی مـوطعیم بـوو، کە طـوعەیمی بـرای لە جەنگی بەدردا بە دەسـتی حەمـزە کـوژرا، ئەویـش بە وەحشـی وت گەر حەمـزەم بـۆ بکـوژی ئـازادت دەکەم، ئەویش بەو هۆکارە لە دوورەوە بە وەشانی ڕمێک حەمزەی قارەمانی شەهید کرد.

دوای بڵاوبـوونەوەی هەواڵی شــەهید بـوونی پێغەمـبەری خـوا ﷺ یەکەم کەس کە پێغەمبەری ئەزیزمانی ناسـییەوە ﷺ کەعبی کوڕی مالیـک بـوو و ڕاسـتەوخۆ پـڕ بە دەنـگ هـاواری کـرد الله اکبر مـوژدە ئەی کـۆمەڵەی موسـڵمانان ئەوە پێغەمـبەری خـوایە، لەو کاتەدا پێغەمبەری خۆشەویسـتمان ﷺ ئاماژەی بـۆی کـرد کە بێـدەنگ بێ و لەوێـدا کـڵاوە ئاسـنین و قەڵغانەکانیـان گـۆڕییەوە و هەر کەس لە بێبـاوەڕان



کەعبی ببینیایە لێی دەدا وایاندەزانی ئەو پێغەمبەرە، بۆیە لە ٢٣ جێگەوە بریندار کرا.

دوای ئەوە هەر موسڵمانێ پێغەمبەری خوای ببینیایە ﷺ ورەی بەرز دەبووەوە و ئازایانە شەڕی دەکرد.

دواتر کۆمەڵێ لە موسڵمانان لە دەوری پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ کۆ بوونەوە بۆ پاراستنی لە دوژمنان، بۆیە دوای ئەمە دوژمنان هێرشەکەیان چڕتر کردەوە، و هەندێک لەوانەی لە دەوری بوون شەهید کران، لەکۆتاییدا تەنها ٩ کەس لە دەوری پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ مایەوە، حەوتیان لە پشتیوانان بوون و دووانیان کۆچەری بوون.

هاوەڵدانەران زۆر نزیک بوونەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ، و ئەمانیش بەردەوام بوون لە پاشەکشە کردن بەرەو چیاکە، و لەو کاتانەدا پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ دەیفەرموو:

کێ ئەوانەمان لێ دوور دەخاتەوە لە بەهەشت هاوڕێم دەبێت.

پیاوێک لە پشتیوانان ڕۆیشتە پێشەوە و شەڕی کرد تا شەهید کرا.

بەردەوام ئەوەی دەفەرموو تاکو هەموو پشتیوانان شەهید کران و تەنها دوو کۆچەرییەکە مانەوە و پێغەمبەری خوا ﷺ پێیانی فەرموو:

بەڕاستی دادپەروەر نەبووین لەگەڵ هاوڕێکانمان.

دوای ئەوە دیسانەوە هێرشەکە چڕتر کرایەوە و چەند هاوەڵێکی تر شەهید کران، لە دوای ئەمانە تەنها طەڵحە مایەوە لە چواردەوری پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ و دەستی کرد بە بەرگری کردن و بۆ ماوەیەکی زۆر جەنگا کە هێندەی ماوەی جەنگ کردنی هاوەڵەکانی پێشوو بوو کە بەرگریان دەکرد لە پێغەمبەری نازدارمان ﷺ، بەردەوام بوو هەتا لە دەستیان دا و هەندێک لە پەنجەکانی قرتا و بەهۆی ئەم لێدانەوە ئەو دەستەی ئیفلیج بوو.

طەڵحە لە ٣٥ یان ٣٧ جێگەوە بریندار کرا بە شمشێر و ڕم و تیر دوای ئەوە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص هات کە تیر هاوێژێکی زۆر لێهاتوو بوو.

بەم شێوەیە پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ ئەو هاوەڵانەی کە ژمارەیان دەگەیشتە ٣٠ کەس خۆڕاگر بوون لە ڕووی هێرشە یەک لەسەر یەکەکانی دوژمن وەستانەوە بۆ ئەوەی وردە وردە پاشەکشە بکەن بەرەو چیای ئوحود.

و پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ لەم جەنگەدا لە چەندین شوێنەوە بریندار کرا.

و دوای ئەوەی گەیشتنە سەر چیای ئوحود هاوەڵدانەران کۆتا هێرشیان کرد، و موسڵمانان بە خۆڕاگرییەوە شەڕیان کرد تا لە شاخەکە دایانیانبەزاندە خوارەوە.

دوای ئەوە دوژمنان تەواو بێهیوا بوون لە سەرکەوتنی تەواو بەسەر موسڵمانان و کۆنترۆڵ کردنی شاخی ئوحود و لەوێش زانیان کە پێغەمبەری خۆشەویستمان □ ﷺ و کۆمەڵێ هاوەڵی تری زۆر قارەمان هێشتا زیندوون زیاتر بێهیوا بوون، بۆیە هەستان بە شێواندن و لەتکردنی جەستەی شەهیدان، یەکێک لەوانە جەستەی



حەمزەی مامی پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ بوو لە لایەن هیندی خێزانی ئەبو سوفیانەوە، کە وەحشی سنگی حەمزەی دڕی و جگەرەکەی دەرکرد و دایە دەستی هیندەوە و ئەویش کەمێکی بە ددانەکانی لێ کردەوە و جووی فڕێیدا نەیتوانی قووتی بدات، ئەمەش لەبەر ئەوە بوو هیند نەزری کرد بوو کە لە جگەری حەمزە بخوات، لەبەر ئەوەی حەمزە باوکی ئەوی کوشت لە جەنگی بەدردا.

پێش ئەوەی بێباوەڕان مەیدانی جەنگ بەجێبهێڵن هاواری دەکرد و کۆمەڵی قسەی لوگەڵ موسڵمانان کرد و لە کۆتاییدا پێیانی وت ساڵی ئایندە لە بەدر بەیەکتر دەگەینەوە، و پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ بە هاوەڵێکی فەرموو کە پێی بڵێت ئەوە بەڵێن بێت لە نێوان ئێمە و ئێوەدا

وە هەروەها ئوبەی کوڕی خەڵەف لە مەککە سوێندی خوارد بوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ بکوژێت، کەهەواڵەکە گەیشت بە پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ فەرمووی: بەڵکو من ئەو دەکوژم إِنْ شَاءَ اللَّه.

ئەوە بوو لەم جەنگەدا ئوبەی خۆی تەواو داپۆشیبوو بە ئاسن جگەلە چاوەکانی نەبێت، بەرەو پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆیشت موصعەبی کوڕی عومەیر بۆ بەرگری کردن لە پێش پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ بوو، ئەو شەهید کرا، و پێغەمبەری خوا ﷺ چاوی بە ئەڵقەیەکی کراوەی کڵاوەکەی ئوبەی کەوت کە لەسەر قوڕقوڕاگەیی بوو و ڕمێکی بۆی هەڵدا و لەو جێگەیە بە ئازارێکی زۆر سەختەوە مرد.

دوای ئەوەی دوژمنـــان لە مەیـــدانی جەنـــگ گەڕانەوە ترســـی ئەوە هەبـــوو کە بگەڕێنەوە بۆ سەر موسڵمانان، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی کێ دەڕوات بە دوایاندا؟

٧٠ کەس ئامــادەیی خۆیــان ڕاگەیانــد بــۆ شــوێنکەوتنیان کە ئەبــو بەکــر و زوبەیریانیش تێدا بوو و پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ فەرمانی پێیان کرد شوێنیان بکەون بۆ چاودێری کردن و ترساندنیان و هەتا بیر لە گەڕانەوە نەکەنەوە.

موسڵمانان نەیاندەزانی دوژمنان بە نیازن بەرەو کوێ بڕۆن، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی:

ئەگەر ئەوانتـان بینی ســواری پشـتی ئەسـپەکانیان بـوون و وشـترەکانیان بە دوای خۆیانـدا ڕادەکێشـا، ئەوا دەیـانەوێ نزیـک ببـنەوە لە خـانو و قەڵاکانی مەدینـە کە ئافرەت و منداڵەکانیان تێدایە، سوێند بە خوا گەر بەو کارە هەستن بەشەڕ دێم لەگەڵیان لە ناو شاری مەدینە، و ئەگەر ئەوان سواری پشتی وشترەکانیان بوون و ئەسپەکانیان بە دوای خۆیاندا ڕادەکێشا ئەوە دەیانەوێ ڕابکەن و دەرباز بن.

و ســەعدی کــوڕی ئەبی وەقاصی نـارد بە شــوێن پێیانــدا، و ئەمـیش بە خێرایـی ڕۆیشت و گەڕایەوە و فەرمووی:

ئەوانم بینی سواری پشتی وشترەکانیان بوو بوون و دەڕۆیشتن و ئەسپەکانیشیان بە دوای خۆیاندا ڕادەکێشا.

موسڵمانان دڵیان خۆش بوو بە ڕۆیشتنی دوژمن.



و پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ لەبەر برینەکانی بە دانیشتنەوە نوێژی نیوەڕۆی بۆ کردن و هاوەڵەکانیش لە پشتییەوە بە دانیشتنەوە کردیان.

دوای تەواو بوونی شەڕ ئافرەتانی کۆچەر و پشتیوانانی ناو شاری مەدینە خواردن و ئاویان بە شان هەڵدەگرت و بۆ هاوەڵانی پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ دەهێنا، و فاطیمەی کچی پێغەمبەری خوا ﷺ و عائیشەی کچی ئیمامی ئەبو بەکریانیش تێدا بوو.

فاطیمە خوای گەورە لێی ڕازی بێت کاتێک باوکی ﷺ بینی بەو شێوەیە بریندارە و ڕووخساری بریندارە بە خوێنەوەیە باوەشی پێدا کرد و دەستی کردە ملی و خوێنەکەی ڕووخساری پاک کردەوە و پێغەمبەری سەروەرمانیش ﷺ دەیفەرموو: تووڕەیی خودا توندتر بووە لەسەر کەسانێک کە ڕووخساری پێغەمبەرەکەیان خوێناوی کردووە، وە تووڕەیی خودا توندتر بووە لەسەر پیاوێک کە بە دەستی پێغەمبەری خوا کوژرا بێت.

و پاشان پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ دەیفەرموو:

خوایە لە گەلەکەم خۆش ببە ئەوان نەزانن.

لە ئەنجامدا ژمارەیەکی زۆر لە موسڵمانان شەهید کران و بریندار بوون، لە بارەی ژمارەی شەهیدەکان چەند ڕایەک هەیە و لە ئەنجامی ئەو ڕایەنە بەوە دەگەین کە نزیکەی ٧٠ کەس شەهید بوون و لە دوژمنانیش بە هەمان شێوە ڕا جیایی هەیە و لە ئەنجامدا بەوە دەگەین نزیکەی ٢٠ کەس یان ٢٢ کەس کوژران.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد تەرمی شەهیدەکان نەشۆردرێتەوە و هەر لە جێگای جەنگەکەدا بنێژرێن، و لەبەر کەمی کفن هەر دوو یان سێ کەسێ لە یەک پارچەدا کفن کران، و ئەوەشی بە تەنها کرا قاچەکانیان بە گژوگیایی بۆن خۆش داپۆشی.

و لەبەر ئەوەی ژمارەیەکی زۆر موسڵمان بریندار بوون و ماندوو بوون لە جەنگەکەدا بۆیە توانای ئەوەیان نەبوو ئەوەندە گۆڕ ئامادە بکەن و بێ توانایی خۆیان بە پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ ڕاگەیاند، و ئەویش فەرمووی کە هەر دوو کەس یان سێ کەسێ لە یەک گۆڕ بنێژن، بەڵام گۆڕەکان قوڵ و چاک ئامادە بکەن، و هەر کەسێکیان قورئانی باشتر زانیبێت یان کۆی کردبێتەوە لە سنگیدا ئەوا ئەو کەسە پێش بخەن لە ناشتندا و دواتر ئەوانی تر.

دوای ئەمانە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بە هاوەڵان کرد لە پشتییەوە ڕیز ببن، و ئەوانیش ڕیز بوون و پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ دەستی کرد بە سوپاس و ستایش کردنی خوای گەورە و نزای کرد لە دوژمنان و کۆمەڵێ داوای کرد لە خوای گەورە.

دوای هەموو ئەمانە هەموو گەڕانەوە مەدینە.



## غەزای حەمرائلئەسەد

پێغەمبەری خوا ﷺ بیری لە بارودۆخەکە دەکردەوە و لەوە دەترسا کە دوژمنان بیر لەوە بکەنەوە دووبارە هێرش بکەنەوە سەریان لەبەر ئەوەی سوودێکی ئەوتۆیان دەست نەکەوت لە جەنگەکە.

بۆیە پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ لە بەیانی ڕۆژی دوای جەنگی ئوحود هانی خەڵکی دا بۆ ڕۆشتن بەرەو ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمن، و ئەمەش لە ٨ی مانگی شەوالی ساڵی ٣ی کۆچی بوو.

پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ پێیانی فەرموو:

تەنها ئەو کەسانە لەگەڵمان دەردەچن کە پێرێ بەشداری شەڕیان کردبوو.

عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی وتی: بێم لەگەڵت؟

پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەتی کردەوە.

و تەنها ڕێگەی بە چەند کەسێک دا بڕۆن لەگەڵیان کە پێشتر بەشداریان نەکردبوو.

هەرچەند موسڵمانان برینداریکی زۆریان هەبوو و لە ترس و دڵەڕاوکێدا بوون بەڵام بە قسەی پێغەمبەری خوایان کرد ﷺ، فەرموویان:

بەسەر چاوان پێغەمبەری خوا.

دوای ئەوە بەڕێ کەوتن و بەردەوام بوون لە ڕۆیشتن تاکو گەیشتنە ناوچەی حەمرائلئەسەد کە ٨ میل لە مەدینەوە دوورە و لەوێ سەربازگەکەیان دانا.



لەوێدا مەعبەدی کوڕی ئەبی مەعبەد ڕۆیشتە خزمەت پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ و موسڵمان بوو، و دەوترێت لەسەر بت پەرستی مابووەوە بەڵام دڵسۆز بوو بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ بەهۆی ئەو پەیمانەی لە نێوان بەنی خوزاعە و بەنی هاشمدا هەبوو.

وتی: ئەی موحەممەد بەڕاستی زۆرم پێناخۆش بوو ئەو کارەساتەی کە بەسەر تۆ و هاوەڵەکانتدا هات، دەخوازین خوا شیفاتان بدات.

پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ پێی فەرموو:

بڕوات ئەبو سوفیان بترسێنێت.

ئەو ترسەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ هەیبوو ڕاست دەرچوو، سوپای هاوەڵدانەران کاتێک لە روحائدا دابەزین کە شەش میل لە مەدینەوە دوورە، دەستیان کرد بە سەرزەنشت کردنی یەکتر و کۆمەڵێکیان بە ئەوانی تری وت:

هیچتان نەکرد تەنها سامی ئەوانتان شکاند و وازتان هێنا لە سەرگەورەکانیان، دەتوانن خۆیان کۆ بکەنەوە بۆتان، بگەڕێنەوە با لە ڕیشەوە دەریان بکێشین.

بەرپرسێکیان کە ناوی صەفوانی کوڕی ئومەیە بوو وتی:

خەڵکینە شتی وەها نەکەن، لەوە دەترسم ئەوانەشی کە دەرنەچوو بوون بۆ شەڕ ئەمجارە بێنە دەرەوە، بگەڕێنەوە ئەوە بردنەوە ئەمجارە بۆ ئێوە بوو، دڵنیانیم لەوەی گەر بگەڕێنەوە سەربکەون.



پێش ئەوەی ئەبو سوفیان لە بنکەکەی خۆی بجوڵێت مەعبەدی کوڕی مەعبەد گەیشتە لای و ئەو کاتە ئەبو سوفیان نەیدەزانی مەعبەد موسڵمان بووە، و پێی وت:

هەواڵی چیت پێیە؟

ئەویش فەرمووی:

موحەممەد و هاوڕێکانی بە ژمارەیەکی زۆرەوە هاتوون بۆتان کە هەرگیز نەمبینیووە، داخیان لە دڵدایە بۆ شەڕ کردن لەگەڵتان، ئەوانەش کە ئەو ڕۆژە لەگەڵی نەبوون ئەمڕۆ لەگەڵی هاتوونە، و پەشیمانن لەوەی بەشداریان نەکردووە، و کۆمەڵێ قسەیان کرد بەیەکەوە و ئەبو سوفیان وتی:

سوێند بێت ئێستا خۆمان کۆ کردۆتەوە تاکو لە ڕەگ و ڕیشەوە دەریان بهێنین، و مەعبەد فەرمووی:

شتی وەها نەکەیت بۆ تۆمە.

ئیدی لەوێدا سوپای مەککە ڕووخا و ترس وبیمیان لێ نیشت، و کەوتنە سەر ئەوەی بەخێرایی بگەڕێنەوە مەککە.

بەڵام ئەبو سوفیان هەستا بە جەنگێکی پڕوپاگەندەیی دوژمنکارانە دژی سوپای ئیسلام، بەڵکو سوپای ئیسلام وەها لێ بکات شوێنیان نەکەون، و بەبێ هیچ گومانێکیش خۆی لە ڕووبەڕووبوونەوە لادەدا.

بۆ ئەم مەبەستەشی کاروانێکی عەبدولقس بەرەو مەدینە دەڕۆیشت، پێیانی وت:

دەكرێت ئەم قسەیەم بگەیەنن بە موحەممەد؟

ئەگەر ئەمەتان كرد كە هاتن بۆ مەككە لە عكاظ كاروانەكەتان بۆ باردەكەم لە شەرابی مێوژ.

وتیان: باشە.

وتی: بڵێن موحەممەد ئێمە خۆمان كۆكردووەتەوە بۆیان، بۆ ئەوەی ڕەگ و ڕیشەی خۆی و هاوەڵەكانی لە بن دەربكێشین.

كاروانەكە بە لای پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوڕێكانی تێپەڕی لە حەمرائلئەسەد و قسەكەی پێیان گەیاند، و موسڵمانانیش بەو قسەیە باوەڕیان زیاتر بوو و بەهێزتر بوونەوە.

سوپای ئیسلام لە ڕۆژی یەكشەممە تاكو چوارشەممە لە حەمرائلئەسەد مانەوە و دوای ئەوە گەڕانەوە مەدینە.

گومانیشی تێدا نییە كە غەزای حەمرائلئەسەد غەزایەكی سەربەخۆ نییە، بەڵكو بەشێكە لە غەزای ئوحود و تەواوكەرێتی.



## ئەنجامی کۆتایی جەنگی ئوحود

سـەرکەوتنی یەکجـاری بـۆ هـیچ لایەک نەبـوو، هەردوولا تـا ڕادەیەک سـەرکەوتن و شکستیشــیان هێنــا، ڕاســتە بێبــاوەڕان گــورزێکی بەهێزیــان لە موســڵمانان دا و مەیـدانی جەنگیـان گـرت بـوو، بەڵام نەتوانیـان دەسـتەکەوتەکانی جەنـگ ببەنەوە لەگەڵ خۆیـان و نە توانیـان لە شـوێنی جەنـگە بـۆ مـاوەی یەک ڕۆژیـش بمێنـنەوە، لەبەر ئەوەی ئەو سـەردەمانە نەریت وەها بـوو لە دوای جەنـگ کـردن لایەنی براوە یەک تـا سـێ ڕۆژ دەمـانەوە لە شــوێنی جەنــگەکە، بێبــاوەڕان ڕاســتەوخۆ دوای جەنگەکە مەیدانەکەیان بەجێهێشت پێش موسڵمانان.

و هەروەهـا نەشـیان تـوانی بـڕۆنە نـاو شـاری مەدینـەوە کە تەنهـا مـاوەیەکی کەم لە مەیدانی جەنگەکەوە دوور بوو.

و جەنـگەکە نەگەیشــتە ڕادەیەک کە بێبــاوەڕان بتــوانن ڕاوی موســڵمانان بنـێن و هەروەها هیچ موسڵمانێکیش بە دیل نەکەوتە دەستیان.

و کاتێــک موســڵمانان ڕۆیشــتنە حەمرائلئەســەد و چەنــد ڕۆژێــک مــانەوە هاوەڵدانەران بوێری ئەوەیان نەبوو شەڕ بکەنەوە لەگەڵیان.

و موسـڵمانانیش هەموویـان لە مەیـدانی جەنـگ هەڵنەهـات بەڵکو کۆمەڵێکیـان تـا کۆتـایی مـانەوە و قارەمانــانە جەنگـان، و دوای ئەوە ڕۆیشــتن لە حەمرائلئەسـەد مانەوە بۆ پارێزگاری و شەڕ کردن بەڵام سوپای بێباوەڕان گەڕانەوە.



بـۆیە بەم شـێوەیە بۆمـان دەردەکەوێـت هەردوولا بە بـێ سـەرکەوتنی تەواوەتـی گەڕانەوە شـوێنی خۆیان و لە گەڕانەوڵشـیاندا سـوپای بێباوەڕان دەستپێشخەریان کرد.

## چالاکییەکانی نێوان جەنگی ئوحود و جەنگی ئەحزاب(خەندەق)

جەنگی ئوحود کاریگەرییەکی زۆر خراپی کردە سەر ناوبانگ و شکۆی موسڵمانان و کێشـە نـاوەکی و دەرەکییەکانی زیاد کـرد و مەترسی لە هەموو لایەکەوە ڕووی کـردە مەدینەی پیرۆز.

جـــولەکە دووڕووەکـــان و عەرەبە هاوەڵـــدانەرەکان بە ئاشـــکرا دوژمنـــایەتی موسڵمانانیان دەکرد و هەندێکیان هەوڵیان دەدا دەست لە کۆمەڵەی موسڵمانان بوەشێنن.

لەگەڵ ئەوەشــە ڕاونـانەکەی حەمرائلئەســەد بە ڕادەیەکـی زۆر ناوبــانگی ســوپای موسڵمانانی پاراست.

إنْ شَاءَ الله لێرەدا باس لە چەند چالاکییەک دەکەین،

_**یەکەم چالاکی سریەکەی ئەبی سەلەمە** بوو کە بە ١٥٠ کەسـەوە بەڕێ کەوتـن بـۆ هەڵکوتـانە سـەر خێڵی بەنی ئەسـەد، کە خۆیان ئامادە کردبوو بـۆ هەڵکوتـانە سـەر موسڵمانان، بەڵام هەواڵ گەیشـتە مەدینـە و پێغەمبەری سـەروەرمان □ ﷺ



ئەم سریەیەی نارد، و لە ئەنجامدا ژمارەیەکی زۆری وشتر و مەڕیان دەست کەوت و بردیان بۆ مەدینە.

دوای گەڕانەوەیان پاش ماوەیەک ئەبی سەلەمە وەفاتی کرد بەهۆی ئەوەی برینێکی غەزای ئوحود هەڵیدابووەوە و لێی پیس کرد و کوشتی.

**چالاکییەکی ترشاندەکەی ڕەجیع** بوو کە خێڵی عضل و قارە چەند کەسێکیان ناردە لای پێغەمبەری خوا ﷺ کە گوایە چەند کەسێکیان لێ بووەتە ئیسلام و پێویستیان بەوەیە کەسانێک هەبن فێری ڕێساکانی ئیسلامیان بکات، بۆیە پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ نزیکەی ١٠ کەسیان لەگەڵدا دەنێرێت بۆ فێر کردنیان، بەڵام لە ڕێگا بە پیلانێکی خۆیان هەر هەموو موسڵمانەکان دەکوژن.

**دانەیەکی ترکارەساتێکی زۆرجەرگبڕو ناخۆش** و پڕ لە خەم بوو بۆ پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ و موسڵمانان، ئەویش ئەوە بوو لەم کارەساتەدا ئەبو بەڕائـ (عامرِی کوڕی مالک) دەڕواتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەری سەروەرمانیش ﷺ بانگی دەکات بۆ ئیسلام ئەویش موسڵمان نابێ، و ناڕازیش نابێ.

جا ئەبو بەڕائـ بە پێغەمبەری خوا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ئەگەر بکرێ هەندێک لە هاوەڵەکانت بنێرە بۆ لای خەڵکی نەجد تا خەڵکی بانگ بکەن بۆ ئاینەکەت، ئومێدم وایە بە دەمتەوە بێن.

پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ پێی دەفەرموێت: دەترسم خەڵکی نەجد شتێکیان لێ بکەن.

ئەویش دەڵێ من پەنایان دەدەم.

بۆیە پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ حەفتا پیاوی لەگەڵ دەنێرێت، ئەمانیش بەڕێ دەکەون تا لە جێگەیەک دادەبەزن بە ناوی بیری معونە کە لە نێوان هەوارگەی خێڵی بەنی عامرڕ و سارای بەنی سەلیم بوو.

دواتر بە دەست حەڕامی کوڕی ملحانەوە نامەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەنێرن بۆ دوژمنی خوای گەورە(عامرڕی کوڕی طوفەیل) و ئەویش سەیری ناکات و فەرمان دەکات لە پشتەوە بیکوژن، بۆیە لە پشتەوە بە ڕمێک لێی دەدەن و شەهید دەکرێ لەو شوێنەدا.

دوای ئەمە عامرڕی کوڕی طوفەیل داوا لە بەنی عامرڕ دەکات دەست بکەن بە شەڕ کردن بەڵام ئەمان بە هانایەوە ناڕۆن لەبەر ئەوەی ئەبو بەڕائ پەنای موسڵمانەکانی دابوو.

دواتر داوا لە خێڵی بەنی سەلیم دەکات و لەو خێڵەدا چەند تیرەییەک بە دەم داواکەیەوە دەڕۆن و گەمارۆی هاوەڵەکان دەدەن و ئەوانیش دەست دەکەن بە شەڕ کردن تا دوا کەسیان شەهید دەکرێ، جگەلە کەعبی کوڕی زەید کە بە بریندادری خۆی دەکاتە مردوو لە نێوان شەهیدەکاندا، و عەمروی کوڕی ئومەیە و مونذری کوڕی عقبە کە لە دەرەوەی سەربازگەکە بوون، کاتێک کە دەگەڕێنەوە لە



دوورەوە داڵ و قەڵەڕەش دەبینن لەسەر سەربازگەکە دەسوڕێتەوە، و دوای ئەوە موندر دادەبەزێت و شەڕ دەکات تا شەهید دەکرێ و عەمروش بە دیل دەگیرێت، دوای ئەوەی دەزانن عەمرو لە خێڵی بەنی مضرە ئازادی دەکەن.

عەمرو کاتێک کە لە ڕێگادا دەبێت بۆ گەڕانەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ لە ژێر سێبەری دارێکدا پشوو دەدات و لەو کاتەشدا دوو پیاو لە خێڵی بەنی کیلاب دێن و لە هەمان شوێن پشوو دەدەن، کاتێک خەویان لێ دەکەوێت عەمرو هەردووکیان دەکوژێت و پێی وا دەبێت کە تۆڵەی هاوەڵەکانی کردووەتەوە و نازانێت ئەو دوو کەسە پەیمانی پێغەمبەری خوایان لە گەردن بووە.

کاتێک دەگاتەوە لای سەروەری مرۆڤایەتی ﷺ و هەواڵە جەرگبڕەکەی لای بیر معونە بە پێغەمبەری خوا ﷺ دەگەیەنێت و باسی ئەوەش دەکات کە ئەو دوو پیاوەی کوشتووە.

پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ تەواو دڵتەنگ دەبێت و ڕووداوەکەی ئوحودی بە بیر دێتەوە و خەمێکی زۆر دەخوات و پێی دەفەرمێت:

تۆ دوو کەست کوشتووە دەبێت خوێنەکەیان بدەم و سەرقاڵی کۆکردنەوەی فیدیە بم لەلای موسڵمانان و جولەکە هاوپەیمانەکان.

هەر ئەمەش بووە هۆی غەزای بەنو نەضیر.

پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ زۆر خەفەتی بەم کارەساتە گەورەیە و کارەساتەکەی ڕەجیع خوارد کە هەردووکیان لە ماوەی چەند ڕۆژێکی کەمدا ڕوویاندابوو و بە

تەواوی خەم و پەژارە دایگرت بۆیە بەردەوام تا ماوەی ٣٠ ڕۆژ لەسەر یەک نزای لەو کەسانە دەکرد کە هاوەڵەکانیان شەهید کرد.

**یەکێکی تر لە چالاکییەکانی غەزای بەنی نەضیر** بوو، کاتێک پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ فیدیەی کۆ دەکردەوە بۆ خوێنی ئەو دوو کەسەی کە عەمروی کوڕی ئومەیە بە هەڵە کوشتیانی و بۆ ئەم مەبەستەش لەگەڵ چەند هاوەڵێکی ڕۆیشتن بۆ لای بەنی نەضیر کە خێڵێکی جولەکە بوون و داخێکی زۆریان لە دڵ بوو بەرامبەر پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ و موسڵمانان، لەبەر ئەوەی ئەم خێڵە لە هاوپەیمانەکان بوون لەگەڵ موسڵمانان بۆیە بە پێی بەندێکی پەیماننامەکە دەبووە ئەرک لەسەر ئەوانیش بەشدار بن لە پێدانی فیدیەکە.

کاتێک گەیشتنە لایان و پێغەمبەری خوا ﷺ باسەکەی پێیان فەرموو ئەوانیش وتیان: باشە ئەبو قاسم لێرە دانیشە هەتا کارەکەت بۆ جێبەجێ دەکەین.

ئەم خێڵەش وەکو ئەوانی تر دوای جەنگی ئوحود ترسیان شکا لە موسڵمانان بۆیە لەم کاتەدا پیلانیان دانا کە پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ بکوژن، بۆیە لە نێوان خۆیان ڕێک کەوتن کەسێک بڕوات و بەردێ گەورە بە سەری پێغەمبەری خوادا ﷺ بەربداتە خوارەوە و بیکوژێت، چونکە پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ لە پاڵی دیوارێکی ماڵی جولەکەیەک دانیشتبوو، کەسێک لە جولەکەکان وتی: شتی وەها



مەکەن، واللّەی هەواڵـی دەدرێتـێ لە بـارەی ئەم کارەتـانەوە، و ئەمەش پەیمـان شکێنییە لە نێوان ئێمە و ئەودا.

بەڵام ئەوان گوێیان نەدا و بەردەوام بوون.

جبریل(سـەلامی خـوای گەورەی لێ بێ) لەلایەنـی خـوای گەورەوە هەواڵەکەی بە سـەروەری مرۆڤـایەتی ﷺ گەیانـد، و ئەویـش ڕاسـتەوخۆ لەوێ هەسـتا و بەرەو مەدینە گەڕایەوە و هـاوەڵان پرسـیاریان لێی کـرد لە بارەی ئەو گەڕانەوە لە ناکاوە و پێغەمبەری خوایش ﷺ هەواڵی پیلانەکەی پێیان فەرموو.

زۆری پێنەچوو پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ کەسێکی نارده لایان و پێیانی فەرموو: لە مەدینـە بـڕۆنە دەرەوە و دراوسـێیەتیم مەکەن، دە ڕۆژ بوارتـان پێ دەدەم، دوای ئەوە ماوەیە هەر کەسێکتان ببینم لە ملی دەدەم.

ئەم خـێڵەیە هـیچ ڕێـگە چـارەیەکی لە پـێش نەمـا جـگەلە دەرچـوون نەبێ، چەنـد ڕۆژێـک مـانەوە بـۆ خـۆ ئامـادە کـردن بەڵام گەورەی دووڕووەکان عەبـدوڵڵای کوڕی ئـوبەی هەواڵی بـۆ نـاردن کە دەرنەچـن و بـڕۆنە قەڵاکانیـانەوە، و دوو هەزار کەسی لەگەڵدایە و دەینێرێت بۆ لایان بۆ پاراستنیان و لە پێناو ئەوان ئامادەن خۆیان بە کوشت بدەن ، و هۆزی قورەیظە و غەطفانی هاوپەیانیانیش پشتیان دەگرن.

ئەوانـیش ڕازی بـوون و هەواڵیـان نـارد بـۆ پێغەمـبەری خـوا ﷺ کە ئەوان لە مـاڵ و حاڵی خۆیان دەرناچن و چی لە دەست دێ با بیکات.

بەهـۆی ئەو کارەسـاتانەی پێشـوو کە باسـکران و چەنـد دانەیەکی تـر و کوشـتنی شـاندەکانی موسـڵمانان و پەیمـان شـکێنی هاوپەیمانەکان و لێـدانیان لە پشـتەوە موسـڵمانەکان داخ و ڕقێکی زۆریـان لە دڵ بـوو، سـەرەڕای ئەو هەمـوو زیـانەی کە تووشـیان هـاتبوو بەهـۆی ئەو ڕووداوانەوە و مەترسـی زۆریـان لەسـەر بـوو و لە سـەرووی هەمووشـیانەوە بەنـی نەضـیر خێڵێکـی پـڕ چەک و بەهێـز بـوون و خـۆ بەدەستەوە دانیان وەها ئاسان نەبوو، بەڵام موسڵمانان هەر بڕیاریاندا لەگەڵیان بجەنگێن.

بەنی نەضیر ڕۆیشتنە ناو قەڵاکانیان و بە بەرد لە موسڵمانانیان دەدا و پشتیان بە باخە خورما و بێستانەکانیان بەستبوو، بۆیە پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ فەرمانی کـرد دارەکـان ببـڕێنەوە و بسـووتێنرێن، و بێگومـان ئەم کـارە و هەمـوو کـارێکی تـر لەسەر ڕێگەپێدانی خوای گەورە بووە.

خێڵـی قـورەیظە نزیـک نەکەوتـنەوە، و عەبـدوڵڵای کـوڕی ئـوبەی و غەطفـان و هاوپەیمانەکانیشـیان ناپاکیـان لێیـان کـرد و کەسـێکیان هەوڵـی ئەوەی نەدا هـیچ شتێکیان بۆ ببات.

گەمـارۆدانەکە زۆری نەخایانـد، تەنهـا ٦ شـەو بەردەوام بـوو و دەوتـرێتیش ١٥ شـەوی خەیانـد، خـوای گەورە دڵیـانی پـڕ کـرد لە تـرس و ملـکەچ بـوون بـۆ موسـڵمانان، هەواڵیـان نـارد بـۆ پێغەمـبەری سـەروەرمان ﷺ کە ئەوان لە مەدینـە دەڕۆنە دەرەوە، و پێغەمـبەری خـوا ﷺ ڕازی بـوو بەمەرجێ تەنها خۆیـان و منـداڵ و



ژنەکانیـان بـڕۆنە دەرەوە لەگەڵ ئەو شـتانەی کە وشـتر دەتوانێـت هەڵیبگرێـت جگەلە چەک.

ئەوانیش ڕازی بوون و ماڵەکانی خۆیان بە دەستی خۆیان ڕووخاند بۆ ئەوەی دەرگا و پەنجەرەکانیان ببەن، هەموو شتێکیان لە شەش سەد وشتردا بار کرد، و تەنها دوو پیاویـان موسـڵمان بـوون کە یاسـینی کـوڕی عەمـرو و ئەبـو سـەعدی کـوڕی وەهەب بوون.

و هەرچی مایەوە لە زەوی و ماڵ و موڵـک و چەک خـوای گەورە هەمـووی تـایبەت کـرد بە پێغەمـبەری ئەزیزمـان ﷺ، لەبەر ئەوە پێغەمـبەری خۆشەویسـتمان ﷺ پێنجیەکی نەکرد و دابەشی کرد بەسەر کۆچەرانی یەکەمدا، و بەشی ئەبو دوجانە و سەهلی کوڕی حەنیفی دا لەبەر هەژارییان.

و ئەوەشی مایەوە لە کەرەستەی جەنگ هەمووی بەخشی لە پێناو خوای گەورەدا.

ئەم غەزایە لە ڕەبیعی یەکەمی ساڵی چوارەمی کۆچیدا ڕوویدا، و خـوای گەورە لەم غەزایەدا تەواوی سورەتی(الحشر)ی دابەزاند.

دوای ئەم غەزایە هەمـوو ئەو خێـڵ و دەشـتەکییانەی مەکـکە و دەوروبەری کە چـاوی ترسـیان شـکابوو لە موسـڵمانەکان بەهـۆی جەنگی ئوحـودەوە دیسـانەوە ترسیان تێدا درووست بوو و نەیاندەوێرا بە ئاشکرا دوژمنایەتی ئیسلام بکەن.

بەشـێوەیەک دەترسـان گەر بیانزانیـایە موسـڵمانان هـاتوون خۆیـان لە کـون و کەلەبەرەکان دەشاردەوە.

دوای ئەم ڕووداوانە ژوانی دیاریکراوی جەنگ نزیک بووەوە کە لە کاتی جەنگی ئوحوددا دیاری کرابوو، لە مانگی شەعبانی ساڵی ٤ی کۆچیدا پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ ١٥٠٠ کەس لە مەدینە دەرچوون بەرەو بەدر، و دە ئەسپ سواریان لەگەڵدا بوو و عەلی کوڕی ئەبی طاڵیب ئاڵاکەی هەڵگرتبوو.

ئەبو سوفیانیش بە ٢٠٠٠ هاوەڵدانەرەوە لە مەککە دەرچوون و ٥٠ ئەسپ سواریان لەگەڵدا بوو، ڕۆیشتن تا گەیشتنە ناوچەی (مر الظهران) و لەوێ وەستان.

ئەبو سوفیان بە سستی و بێتاقەتییەوە لە مەککە دەرچوو بوو، بیری لە ئەنجامی جەنگ دەکردەوە لەگەڵ موسڵمانان ترسی لێ نیشتبوو، کە لەم ناوچەیدا دابەزین تەواو ورەی ڕووخا.

بە هاوەڵەکانی وت ساڵێک بڕۆن بۆ شەڕ ساڵی تێرئاویی و سەوزایی بێ و درەختی تێدا ئاو بدەن و تێر شیر و ماست بخۆن، ئەمساڵیش وشکە ساڵی و بێئاوییە، من دەگەڕێمەوە و ئێوەش بگەڕێنەوە.

پێدەچێت تەواوی سوپاکەش ترسێ زۆر لەدڵیان نیشتبێت بۆیە هەموویان گەڕانەوە بەبێ ئەوەی هیچ کەسێکیان ناڕەزایی هەبێ.

موسڵمانەکانیش بۆ ماوەی ٨ ڕۆژ لە بەدر مانەوە و چاوەڕێی دوژمنیان کرد بەڵام دوژمن هەر لە ڕێگا گەڕایەوە.



پاشان گەڕانەوە بۆ مەدینە و جڵەوی دەسەڵاتیان دیسانەوە کەوتە دەست و ترسیان لە دڵی خەڵکیدا زیاتر بوو.

ئەم غەزایەش بە ناوی (بدر الموعد) و (بدر الثاني) و (بدر الاخره) و (بدر الصغرى) بەناوبانگە.

دوای ڕووداوی بەدری بچووک ئاشتی و ئارامی لە مەدینە بۆ ماوەی ٦ مانگ بەردەوام بوو، دوای ئەو ماوەیە هەواڵ بۆ پێغەمبەری ئەزیزمان ﷺ هات خێڵەکانی دەوروبەری دومەتولجندل کە ناوچەیەکی نزیک شام بوو ڕێگریان لەو کاروانانە دەکرد کە بەوێدا تێدەپەڕن، و خۆیان ئامادە دەکەن بۆ ئەوەی هەڵبکوتنە سەر شاری مەدینەی پیرۆز.

پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ بە هەزار سوارەوە بەڕێکەوتن و پیاوێکی ڕێبەری لەگەڵ خۆیاندا برد، ناوی مەذکور بوو.

بە شەو بەردەوام بوون لە ڕۆیشتن و بە ڕۆژ خۆیان پەنا دەدا، نزیکی شێوان بوو دایان بەسەر دومەتولجندل و مەڕوماڵات و موڵکێکی زۆریان بە دەستکەوت بۆ مایەوە و هەر کەسەو بەلایکدا هەڵهاتن.

پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ و سوپاکەی چەند ڕۆژێک لەوێ مانەوە و چەندین سریە و تیپی سەربازی نارد بۆ دەوروبەری ناوچەکە بەڵام هیچ کەسێکیان دەست نەکەوت، پاشان گەڕانەوە مەدینە.

بەم دەستپێشخەرییە سەروەری مرۆڤایەتی ﷺ سەرکەوتنی بەدەست هێنا لە بەرقەرار کردنی ئاسایش و کۆنترۆڵ کردنی ناوچەکە، و هەموو نەیاران و دووڕوان بە ناچاری بێدەنگ بوون و سەریان شۆڕ کرد، و هەڵچوونی قورەیشیش دامرکایەوە، و دەرفەتێکی باش بوو بۆ موسڵمانەکان تا پەیامی خوای گەورە بڵاو بکەنەوە لە دەوروبەریاندا.



## جەنگی خەندەق(ئەحزاب)

پـاش ئەو شـەڕ و سـریانەی کە زیـاتر لە سـاڵێکی خایانـد هێمنی و ئاسـایش بـڵاو بووەوە و دوورگەی عەرەب هێور بووەوە، بەڵام جولەکە هەمیشە لە ئاکامی پەیمان شکێنی و ناپاکی و خراپی خۆیانەوە چەندەها جار تووشی سەرشۆڕی و نەهامەتی دەهـاتن، ئەواتەی هێشـتا هۆشـیان بەبەردا نەهـاتبوو و پەنـدیان وەرنەگـرت بـوو بەردەوام بـوون لە ئـاژاوە گێڕی بـۆیە لـە سـاڵی ٥ی کـۆچی جولەکـەکانی هـۆزی بـەنی نـەضیر هـانی هـۆزە عەرەبـەکانیان دەدا بـۆ جـەنگ کـردن دژ بـە پێغەمبـەری خـوا (ﷺ)و هـاوەڵانی، لـە ئەنجامـدا هەنـدێک لـە هـۆزە عەرەبـەکان وەڵامیـان دانـەوە لەوانە هۆزی بەنی سەلیم و هۆزی بەنی ئەسەد و هۆزی غەطفان و کینانە بوون. لەگەڵ ئەم هاوپەیمانیە قورەیشیەکانیش هاتنە ڕیزیان بۆ سەرپەرشتی کردنی ئەم هاوپەیمانییە و هێرش کـردن بـۆ سـەر شـاری مەدینـە بـۆ کۆتـایی هێنـان بـە ئـایینی پیرۆزی ئیسلام بە یەکجاری .

سـەبارەت بـە ژمـارەی سـەربازەکانی هـۆزە عەرەبـە موشـریکەکان نزیکـەی دە هـەزار سەرباز بوون بە سەرپەرشتی گەورەی هۆزەکان بەم شێوەیە:

لەلای ڕاسـتەوە چـوار هەزار جەنگـاوەر بە سـەرکردایەتی ئەبـو سـوفیان کە پێکهـاتبوون لە قـورەیش و بەنـی سـولەیم، لە بەری ڕۆژهەڵاتەوە بەرەبـابە جیاوازەکانی غەطفان ،بەنی فەزارە بە فەرمانـدەیی عـوەینەی کوڕی حیسـن، مورە

بە فەرماندەیی حاریسی کوڕی عەوف، بەنی ئەشجەع بە فەرماندەیی مەسعەری کوڕی ڕەعەیلە بەڕێکەوتن.

و ژمارەی موسلمانان تەنها سێ هەزار سەرباز بوو بە سەرکردایەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ).

لە ساڵی ٥ ی کۆچی هۆزە عەرەبە موشریکەکان و جولەکەکانی هۆزی بەنی نەضیر بڕیاریاندا کۆتایی بە موسڵمانان بێنن و شاری مەدینە وێران بکەن.

پێش ئەوەی لەشکری موشریکەکان بەڕێبکەوێت پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕاوێژی بە هاوەڵان کرد سەبارەت بە چۆنیەتی ڕووبەڕووبوونەوەی موشریکەکان، هاوەڵی بەڕێز سەلمانی فارسی ڕەزای خوای لێبێت بە پێغەمبەری خوای (ﷺ) فەرموو:

کە خەندەقێکی دوور و درێژ لێبدەن لە دەوری مەدینە بۆ ئەوەی لەشکری موشریکەکان نەتوانن بێنە ناو شاری مەدینەوە ئەمەش نەخشەیەکی کارزانانە بوو کە پێشتر گەلانی عەرەب ئاگاداری تەکنیکێکی وەها نەبوون.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێشنیاری سەلمانی لەلا جوان و پەسەند بوو بۆیە فەرمانی بە موسلمانان کرد دەست بکەن بە خەندەق لێدان بۆ ئەوەی شاری مەدینە پارێزراو بێت لە مەترسی هێرش کردنی موشریکەکان، هەر دە کەس لە پیاوانی موسڵمانان بەرپرسی هەڵکەندنی چل باڵ لە خەندەقەکە بوون وە پێغەمبەری خودا (ﷺ) یارمەتی دەدان.

لە صەحیحی بوخاریدا هاتووە کە بەڕائی کوڕی عاذیب دەیگوت:



دیتم کە پێغەمبەری خودا ( ﷺ ) هێندەی خۆڵی خەندەقەکەی بار کردبوو تەواو خۆڵین ببوو بە چەشنێک خۆڵین ببوو کە پێستی زگی نەدەبینرا، سەرباری ئەوەشی کە زگی مووین بوو لە کاتی جێبەجێکردنی کارەکەیدا.

لە بەیانی ڕۆژێک لە ڕۆژەکانی مانگی شەوال لەشکری موشریکەکان دەرکەوت و هاتن بەرەو لای شاری مەدینە بۆ کۆتایی هێنان بە ئیسلام و موسڵمانان.

لە دوای ئامادەبوونی لەشکری موشریکەکان بۆ هێرش کردن هەندێک لە لیواکانیان هێرشی توندیان هێنا بەرەو لای شاری مەدینە بەڵام لە ناکاو لە بەردەمیان ڕووبەرووی چاڵێکی زۆر گەورە بوونەوە و نەیانتوانی تێبپەڕن؛ وە موسڵمانان لەوبەری چاڵەکەوە موشریکەکانیان تیر باران دەکرد بۆیە موشریکەکان بە ناچاری گەڕانەوە شوێنی سەربازگەی خۆیان.

یەکێک لە موشریکەکان بەناو عەمرِی کوری وود هەوڵیدا لە کۆتایی خەندەقەکەدا بە ڕێگایەکی تەسک بپەڕێتەوە، بەڵام ئیمامی عەلی ڕەزای خوای لێبێت ڕووبەڕووی عەمرِ بویەوە و ڕووبەڕوو بوونەوە لە نێوانیاندا دەستی پێکرد و ئیمامی عەلی بە پشتیوانی خوای گەورە عەمرِی کوڕی وودی کوشت و هاوڕێکانیشی ڕایانکرد و گەڕانەوە ناو سەربازگەی موشریکەکان.

موشریکەکان چەند جارێک هەوڵیاندا ئەم چاڵە ببڕن و تێبپەڕن بەڵام بەردەوام شکستیان دەهێنا و سەرکەوتوو نەدەبوون، بۆیە موشریکەکان بڕیاریاندا کە داوای هاوکاری لە جولەکەکانی بەنی قورەیظە بکەن بۆ ئەوەی ڕێگەیان پێ بدەن

کە لە ڕێگەی ناوچەی ئەوانەوە بێن بۆ ناو شاری مەدینە، ئەم هۆزە جولەکەیە ئەگەر چی هاوپەیمانی ئاشتەواییان هەبوو لەگەڵ پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەڵام ناپاکییان کرد و هەوڵی هاوکاری موشریکەکانیان دەدا و خواردنیان بۆ لەشکری موشریکەکان دەنارد.

کاتێک پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەستی بە ئەمە کرد بەشێک لە سەربازەکانی ناو لەشکرەکەی نارد بۆ لای بەنی قورەیظییەکان بۆ ئەوەی چاودێریان بکەن کە لە باشووری شاری مەدینە بوون .

بەردەوام هەوڵیان لەناوبردنی ئیسلام و موسڵمانان بوو .

بەڵام پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە پشتیوانی خوای گەورە لە ڕێگەی هاوەڵێکی زیرەک و لێهاتوو بە ناوی نەعیمی کوڕی مەسعود ڕەزای خوای گەورەی لێبێت توانی پەرتەوازەیی بخاتە نێوان موشریکەکان و جولەکەکانی هۆزی بەنی قورەیظە و هاوپەیمانیەکەیان تێک بدات .

موشریکەکان دوای ئەوەی نەیانتوانی لە خەندەقەکە بپەڕنەوە بۆ لای شاری مەدینە بڕیاریاندا کە گەمارۆی ئابووری بخەنە سەر شاری مەدینە، ماوەی ٣ هەفتە ئەم گەمارۆیە بەردەوام بوو، کە بووە هۆی بڵاو بوونەوەی ترس و برسیەتی لە ناو موسڵمانان، موسڵمانان خواردنی کەمیان هەبوو و موشریکەکان جولەکەکانیش، پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە خوای پەروەردگار پاڕایەوە کە لەشکری بێباوەڕان بشکێنێت و موسڵمانان سەرکەوتوو بکات، خوای پەروەردگار دوعای



پێغەمبەرەکەی (ﷺ) قبوڵ کرد و بایەکی بەهێزی بۆ سەر لەشکری موشریکەکان نارد و خێوەتەکانی تێک و پێکدا و پەرتەوازەی کردن موشریکەکان بەرگەی ئەم بایە بەهێزەیان نەگرت و بە ناچاری بڕیاری کشانەوەیاندا بۆ مەککە.

ئا بەم شێوە یەکێک لە دیارترینی جەنگەکانی نێوان موسڵمانان و موشریکەکان کۆتایی هات بەسەرکەوتنی موسلمانان.

خوای پەروەردگار موسڵمانانی پارێزراو و سەرکەوتوو کرد لەو جەنگەدا کە پێی دەوترێت جەنگی ئەحزاب، وە بەناوی ئەو جەنگەوە خوای پەروەردگار سورەتێکی تەواوی دابەزاندووە لە قورئانی پیرۆزدا.

موسڵمانان لە دوای سەرکەوتنیان لە جەنگی ئەحزاب وە پێشی دەوترێت جەنگی خەندەق هێز و شکۆیان زیاتربوو، وە بوون بە یەکێک لە هێزە بەهێزەکان لە نیمچە دوورگەی عەرەبی، قورەیشییە موشریکەکان ناچاربوون پەیمانی ڕاگرتنی جەنگ ببەستن لەگەڵ موسڵمانان.



## سەرچاوەکان:-

١ _ گوڵاوی سەرمۆر

٢ _ پوختەیەکی ڕاست و ڕەوان لە ژیاننامەی پیرۆزی پێغەمبەری پێشەوامان (ﷺ)، نوسینی محمد الشیخ طاهر البرزنجی.

٣ _ ٢٥٠ سؤال وجواب في السيرة النبوية الشريفة

٤ _ ژیاننامەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) نووسینی مامۆستا محمد مەلا فائق.

٥ _ وێب سایتە ئیسلامییە باوەڕ پێکراوەکان(زۆر بە کەمی).